زنجیرەی / باچاکتر ئیسلام بناسین!
ئاڵقەی سێیەم

# ڕۆژی دوایی

نووسینی
علی باپیر



چاپی یەکەم

# پێشکەش بێ

١- بەو مسوڵمانانەی کە بەڕاستی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیەو ، دایمە لەیادیانەو بەردەوام سەرگەرمی ئەوەن خۆی بۆ ئامادە بکەن .

٢- بەو خواناسانەی کە دەزانن ڕۆژی دوایی ڕۆژی تیێدا درەوشانەوەی دادگەری ی خوایە بە چاکترین شێوە ، نەک جێگای بەرتیل دان و واسطە کردن و تکای بێ جێ .

٣- بەو بڕواپتەوانەی کە ژیانی دنیا بە کێڵگەی دوا ڕۆژو مەیدانی تاقیکرانەوە دادەنێن و ، دەزانن کە پردی بەسەردا ڕەت بوونەو ، ژیانی ڕاستەقینە تەنیا ژیان و گوزەرانی بەختەوەرانەی نێو بەهەشتی بەرینە .

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز !

ڕۆژی دوایی ( الیوم الآخر ) زاراوایەکی گرنگ و بنچینەیی‌یە لە بەرنامەی خواداو دووەمین پایەو کۆڵەکەی بیروباوەڕی ئیسلامیشە .

بەڵام لەسۆنگەی بێ ئاگایی زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی لە دوو سەرچاوەی ڕوون و بێ خشپ و خاڵی ئیسلامەتی ؛ قورئان و سوننەت ، ئەم زاراوە مەزنەش وەک هاوەڵەکانی دیکەی لیتەو لاڵ و تۆزو خۆڵێکی بێڕەزای لێهالاوەو ڕووی ڕاستەقینەی گەشی ون بووەو ، کەمتر وایە بەو واتاو مەبەست و چۆنیەتی‌یەی کە خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم مەبەستیانە بەکاربهێنرێ .

جا بێگومان هەر ئەو حاڵی نەبوون و خراپ تێگەیشتنەشە کە بۆتە هۆی ئەوەی خەڵکێکی مسوڵمان یان خۆبەمسوڵمان زان هەرچەندە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە ، بەڵام ئەو بڕوا پێ بوونەیان هیچ جۆرە کاریگەری یەکی نەبێ لە هەڵس وکەوتی ڕۆژانەو کاروباری ژیانیان دا .

ئاخر مرۆڤ چۆن بیربکاتەوە هەر ئاواش دەژی ، واتە جۆری بیرکردنەوەو تێڕوانینی مرۆڤە کە شێوەی ژیان و ڕەفتارەکانی دیاری دەکات ، جا مرۆڤێک پێی وابێ ڕۆژی دوایی لەجیاتی جێی چەسپاندنی دادگەری و حەق بێ ، جێی واسطەو واسطەکاری و بەرتیل و تکا ( شفاعة ) ی بێ‌جێیە ، دیارە ئیمانێ بەنیسکێ دەسپێرێ و بەهەویا واسطەو بەرتیل و

تکاو ڕەجایەکی بێجێ کە بیری خەیاڵچن و ئەفسانەسازی هێناویەتەدی ، پشتێندی لێ دەکاتەوە ، دەستی لێ وەبەن سەری دەداو گوێ ناداتە کارو کردەوەو ڕەفتارو ئاکاری پەسندی مسوڵمانانە .

بەڵکو لەمەش خراپتر کە بەهەڵە حاڵی بوون لە وشەی ( ڕۆژی دوایی ) و چۆنیەتی‌یەکەی وایان لە زۆربەی خەڵکی کردوە کە لە جێبەجێ کردنی کارو ئەرکەکانی ئیسلام‌دا ساردو سڕو لامسەللایی بن ، بەهەڵە بەکارهێنان و بەخراپی ئاراستە کرانی وشەی ناوبراو بۆتە هۆی پەیدابوونی دەستەیەکی نەفام و بیرکورت ، کە وا پێشان دەدەن بڕوایان بە زیندووبوونەوەو سزاو پاداشتیش نیە !!

جا مسوڵمانی هاوبڕوای ئازیزو بەڕێزم !

بەیارمەتی خوای میهرەبان و تۆڵەستێن هەوڵ دەدەین بەکورتی‌و پوختی لەم ئاڵقەیەدا چەمک و مەبەست و واقیع و چۆنیەتی ( ڕۆژی دوایی ) بخەینەڕوو و ، هەر لیتەو لاڵ و تۆزو خۆڵێکی لێی هالابێ لێی بکەینەوەو بیتەکێنین ، تاکو چیدی ڕووی گەش و واقیعی‌ی وشەی ناوبراو لەبن هەوری لێ حاڵی نەبوون و سەرەوبن حاڵی بوون دا نەمێنێتەوەو بێتەدەرێ و ، بەم کارەش بتوانرێ هەنگاوێکی دیکە بنرێ لەرێ ی چاکتر ناسینی ئیسلام‌داو سەرەنجام یەکەمین قۆناغی ڕێ ی بەرەوخوا چوون و بووژاندنەوەی ئیسلام ببڕرێ و خشتی یەکەمی کۆشکی بەرزی ئەو ئامانجە گرنگ و پیرۆزە لەنێو گەلەکەمان دا ڕۆبنرێ .

لەخوداش داواکارم بمانکاتە مسوڵمانێکی وا کە پیاوی

ئەم دنیاو ئەو دنیاش بین .

کوردستانی خواروو ( بەشە کوردستانی سەربەعێڕاق )

دێ ی / گەڵووی ماخۆبزنان

١٤٠٧ ی کۆچی
١٩٨٧ ی زایینی

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری خۆشەویست !

ئەم کتێبەی بەردەستت بەم شێوەیەی خوارێیە :

سەرەتا لە (١٣) خاڵان دا (١٣) باسی کورت بەڵام گرنگمان لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت دا ، لەبارەی پێناسەکردن و خستنەڕووی چۆنیەتی ڕۆژی قیامەت و قۆناغو ڕووداوو کارەساتە مەزنەکانیو ، ژمارەیەک لە دیمەنە گرنگ و دڵبزوێنەکانی، نووسیون .

هەڵبەتە جاروبار بەبۆنەی خستنەڕووی سەرەنجامی چاکەکاران و بەدکارانەوە ، سەرێکیشمان بە بەهەشت و دۆزەخدا گرتوەو لەبەر تیشکی ئایەتەکانی قورئان دا هەندێک دیمەنمان لێ ڕانواندوون .

ئنجا لە حەوت خاڵان دا پەرێزو ئەنجامو بەرهەمی بڕوا بەدوا ڕۆژ بوونمان لە ژیانی ئینسانی مسوڵماندا خستۆتەڕوو، کە ئەمانەن :

١- خۆسازکردن بۆ بەردادگای خوا .

٢- جڵەو توندکردنی ئەسپی نەفس .

٣- دنیا بەکەمگرتن ( الزهد ) .

٤- گرنگی دان بەژیانی دنیا .(١)

---

(١) مەبەست لە بەکەمگرتنی دنیا ، بەکەمگرتنیەتی لەڕووی تێدا ڕابواردن و لەزەت وەرگرتن لە نازو نیعمەتەکانیەوە ، وە مەبەست لە گرنگی پێدانی گرنگی پێدانە لەڕووی ژیان و گوزەران و هەڵسوکەوتکردن و تەمەن بەڕێ کردنەوە ،

٥- خۆپاراستن لە ئازاردانی خەڵکی .
٦- جەرگداری ی و فیداکاری ی .
٧- کات بەفیڕۆنەدانی بەبەلاش .

ئەم خاڵەی کۆتاییش لە (١٣) خاڵان دا باسکراوەو، هەندێک باس و بابەتی گرنگیان تێدا خراونەڕوو .

ئنجا لێرەدا کۆتایی بە دەقی ئەم ئاڵقەی سێیەمە هێنراوە، بەڵام بەکورتیو گوشراوی لە دووتوێ ی پاشکۆیەکدا پێنج بەڵگەی سادەو بەهێز لەسەر سەلماندنی هاتنی ڕۆژی دوایی هێنراونەوە .

پاشان ( دواقسە ) م لەچەند خاڵێکدا عەرزکردووی .

ئیدی بەهیوای تێگەیشتنی قووڵترو چاکتر بەمەبەستی پێگەیشتنی زیاترو زیاتر .



---

بەکورتی ئێمەی مسوڵمان ( ژیانی دنیا ) وەک ( جێگای ڕابواردن ) بەکەم دەگرین ، چونکە جێگای ڕابواردنی ڕاستەقینە بەسدواڕۆژە ، بەڵام ( ژیانی دنیا ) وەک ( شوێنی تاقیکردنەوە ) زۆر بەگرنگ سەیردەکەین و هەر تاقە سەعاتێکی بە هەزاران ساڵی ژیانی نێو بەهەشت ناگۆڕینەوە !!

# پێناسەیەکی کورتی ڕۆژی دوایی

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە ڕۆژی دوایی دوایین قۆناغی سەفەری ژیانی ئینسانەو، (١) بە تێکچوونی ژیانی دنیاو بوونەوەر دەست پێ دەکاو (٢) بە جێگیربوونی بێبڕواو تاوانباران لە دۆزەخی گەرم و بەتین داو، (٣) نیشتەجێبوونی

---

(١) ( یا أیها الأنسان إنّک کادح إلیٰ ربّک کدحاً فمُلاقیه . فأمّا مَن أوتي کتابه بیَمینه فسوف یُحاسَب حسابا یسیرا . ویَنقلب إلی أهله مسرورا . وأمّا مَن أوتي کتابه وراء ظهره فسوف یدعوا ثبورا ویصلی سعیرا ) الأنشقاق / ٦ - ١٢ . واته :
ئەی ئینسان تۆ ڕەنج دەدەی هەتا دەگەیە پەروەردگارت و تووشیشی دەبی . جا ئەوەی بەڕاستەی نامەی کردەوانی وەربگرێتەوە ئەوە لێپرسینەوەیەکی سووکی لەگەڵ دەکرێ و بە دڵخۆشی دەگەڕێتەوە نێو کەس وکارەکەی ، بەڵام ئەوەی لەلای پشتەوەی ڕا نامەکەی وەربگرێتەوە ، ئەوە لەوەپاش مردن بەئاوات دەخوازێ و دەخرێتە نێو کڵپەی ئاگر - ی دۆزەخ - ەوە .

(٢) ( یوم تُبَدّل الأرض غیر الأرض والسموات وَبرزوا للّه الواحد القهار ) إبراهیم / ٤٨ . واته :
ئەو ڕۆژەی کە زەوی و ئاسمانەکان دەگۆڕرێن ، وە - مرۆڤەکان - بۆ خودای تاکی دەستەڵاتدار دێنە گۆڕێ .

(٣) ( وسیق الذین کفروا إلی جهنم زمرا .. ) الزمر / ٧١ . واته : وە ئەوانەی کە کافر بوون کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو دۆزەخ بەڕێ کران ..

بڕواداراني چاكەكار لە بەهەشتي ڕازاوەو بەريـــن دا (١)
كۆتايي پێ دێ .

---

(١) ( وسيق الذين اتقوا ربهم إلى الجنة زمرا .. ) الزمر/٧٣.
واتە :
وە ئەوانەی كە پارێزيان لە پەروەردگاريان كردبـــوو
دەستە دەستە بەرەو بەهەشتێ بەڕێ كران ..

تێبيني :
بێگومان بەڕێ كراني كافراني تاوانبارو خواناسانـــي
چاكەكار لەڕۆژێ دواييدا زۆر لێك جياوازن - هەرچەنـــدە
لێرە هەر بە يەك تەعبير باس كراون - وەك لە سوورەتـــي
( مريم ) دا فەرموويەتي :( يوم نحشر المتقين إلى الرحمن
وفدا . ونسوق المجرمين إلى جهنم وردا ) / ٨٥ ، ٨٦ .
واتە :
ئەو ڕۆژەی كە پارێزكاران بەرەو لای - خوای - ميهرەبان
بەسواری بەڕێ دەكەين ، وە تاوانباران بەتينوەتي بـــەرەو
دۆزەخ لێ دەخورين .

دەبينين كە شێوەی بەڕێ كردني پارێزكاران وەك بـــەڕێ
كردني ئەو نوێنەر ( وفد ) انە وايە كە بەرێزو حورمەتەوە
دەچنەلای پادشاو حوكمرانەكان ، بەلام بەڕێ كردني تاوانباران
لەشێوەی لێخورين و ڕەپێچەك داني مەڕومالاتێك دايە كە بە
تينوەتيو زەبووني بەرەو مۆلگاو شوێني ئاودران وەپێش خۆ
دەدرێن !! *

---

* بڕوانە ( مختصر تفسير الطبري ) ص ٣٤٩ ، وە ( مفـــردات
القرآن - تفسير وبيان ) ص ٣١١ ، محمد حسين الحمصي .

# حیکمەتی هەبوونی ڕۆژی دوایی

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی ئەنجامی سروشتیی بڕوا بەخوا بوون و بڕوا بەپێغەمبەر بوونە ،[1] وە هاتنی ڕۆژی سزا و پاداشت ئەنجامی مسۆگەری دادگەری و کاربەجێیی خودایە ، واتە دادگەری و کاربەجێیی خودا وای لێ چاوەڕێ دەکرێ کە چاک و خراپ وەکو یەک حیسابیان بۆ نەکرێ و ڕەش و سپی لێک جوێ بکرێنەوەو بەسزا و پاداشتی پڕبەپێستی خۆیان بگەن .[2]

---

(١) واتە هەروەک چۆن بەهۆی بڕوا بەخوا بوونەوە بڕوا بەپێغەمبەر بوون وەدی دێ ، چونکە هەرکەسێک خوای ناسی دەزانێ وای لێ چاوەڕوان ناکرێ کە بەندەکان وێڵ بکا و هیچ پێغەمبەریان بۆ نەنێرێ و بەرنامەیان بۆ ڕەوان نەکات ، وەک خوای بەخشندە فەرموویەتی : ( وما قدروا الله حق قدره إذ قالوا ما أنزل الله على بشر مِنْ شيءٍ ) الأنعام / ٩١ . واتە : وە وەک بۆخوا پێویستە ڕێزیان لێ نەگرتوە کە دەڵێن خوا هیچی نەناردۆتەسەر هیچ مرۆڤێک .
بەهەمان شێوەش لەئەنجامی ناسینی خودا و ناسینی پێغەمبەرو ئەو بەرنامەیەش دا کە پێیدا نێرراوە ، مرۆڤ دەزانێ کە پێویستە ڕۆژێک هەبێ لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێ ، داخوا تا چ ڕاددەیەک بەو بەرنامەیەوە پابەندبووە کە خوا بە پێغەمبەردا بۆی ناردوە !

(٢) ( أفحسبتم أنّما خلقناكم عبثاً وأنّكُم إلينا لاتُرجعون ؟ فتعالى الله الملك الحق ) المؤمنون / ١١٥ ، ١١٦ . واتە : ئایا پێتان وایە کە بەگاڵتە دروستمان کردوون و ئێوە ناگەڕێنەوە لامان ؟ بەرزی و پاکی بۆ خودای فەرمانڕەوای

راستەقینە ..

(أم نجعل الذين آمنوا وعملوا الصالحات كالمفسدين في الأرض أم نجعل المتقين كالفجار ؟ ) ص / ٢٨ . واتە :
یان ئایا ئەوانەی برواداربوون و رەفتاری چاکیان کردوە وەکو ئەوانەیان سەیردەکەین کە خراپەکاری یان کـردوە لەسەر زەوی ! یان ئایا پارێزکاران وەکو بەدکـاران دادەنێین ؟!

تێبینی :
ئەم شێوە تەعبیرە کە لەقورئانیدا زۆرجاران دووبـارە دەبێتەوە ، پێی دەگوترێ ( الأستفهام الأنكاري ) واتە : پرسیارکردنێکی رەخنەگرانە ، واتە : لێرەدا پرسیارکردنەکە لەسەر شێوەی ئەسڵی خۆی نیە کە چاوەڕێ ی وەڵامی دوێنـراو ( مُخاطَبْ ) بێ ، بەڵکو وەڵامی پرسیارکردنەکە هەر لەخـودی خۆی دا شاراوەتەوە ، کە بریتیە لە نەفیو ئینکاری کردنی ئەو شتەی کە پرسیاری دەربارە دەکرێ و ، بێ وەڵامی یەکەش ئاماژەیە بۆ ئەوە کە بابەتی پرسیار دەربارەکراو هێندە روون و ئاشکرایە جێی مشتومڕ نیەو حەوجێی بـە وەڵام ناکات .

# لەڕۆژی دوایی داچ دەقەومێ؟

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە ڕۆژی دوایی لە دوو قۆناغان پێک دێ ، لە قۆناغی یەکەمدا بۆ یەکەمین جار فوو بە کەڕەنا ( صور ) دا دەکرێ و لەئەنجامی ئەوەش دا سەرلەبەری بوونەوەر بەسەریەک دا دەتەپێ و هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ ،(١) وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە لەهۆش خۆی دەچێ و دەمرێ ، مەگەر ئەوەی خودا بیەوێ نەمرێ ، وە لە قۆناغی دووەمدا بۆ جاری دووەم فوو بە کەڕەنادا دەکرێ و سەرلەنوێ هەرچی زیندوو بووە لە زەوی و ئاسمانەکان دا زیندوو دەکرێتەوەو ، لە گۆڕەپانی

---

(١) لەو دیمەنانەی کە لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی دا دێنەبەرچاو ، ئەمانە زۆربەو سەرەکیەکانیانن :

١ـ شەق و پەق بوونی ئاسمان .
( إذا السماء انفطرت ) الأنفطار / ١ .

٢ـ کووژانەوەو پێچرانەوەی ڕۆژ ،
هەڵوەرینی ئەستێرەکان ،

٤ـ هەڵقەندرانی شاخەکان ،

٥ـ وێڵ کردنی ماڵی بەقیمەت ،

٦ـ گرگرتنی دەریاکان ،
( إذا الشمس كورت . وإذا النجوم انكدرت . وإذا الجبال سيرت . وإذا العشار **عطلت** ..... وإذا البحار سجرت ) .
التكوير / ١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٦ .

٧ـ بەرزبوونەوەو پێکدادرانی زەوی و شاخەکان .
( وحملت الارض والجبال فدكتا دكة واحدة ) الحآقة / ١٤ .

٨ـ قاڵ بوونەوەی ئاسمان .

٩ـ شکنرانەوەی شاخەکان وەک خوری پەرەکراو .
( يوم تكون السماء كالمهل وتكون الجبال كالعهن ) .
المعارج / ٨ ، ٩ .

کۆکردنەوەو لێپرسینەوە ( الحشر والحساب ) دا ڕادەوەستن[1]، چ فریشتە بووبن ، چ مرۆڤ ، چ جند ، چ ئاژەڵ .[2]

---

(1) خوای پەروەردگار ئاوا باسی هەردووک قۆناغەکان دەکات ، ( ونفخ في الصور فصعق مَنْ في السموات ومَنْ في الأرض إلاّ مَنْ شاء الله ، ثم نفخ فيه أخرى فاذا هم قيام ينظرون ) .
الزمر / ٦٨ .
وە فوو بەکەڕەنادا کرا ـ لەلایەن *ئیسرافیلەوە ـ یەکسەر هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەبوو مردن ، مەگەر ئەوەی خودا حەزبکات نەمرێ ، دوایی جارێکی دی فووی پێداکرا ، بەکسەر ئەو ـ مردوو ـ انە ڕاستبوونەوەو چاوەڕێ ـ ی فەرمانی خودا ـ بوون .

---

* ئەوە کە ئەو فریشتەیەی فوو بەکەڕەنادا دەکات ناوی ( إسرافيل ) ە ، فەرموودەی پێغەمبەری ـ صلی الله عليه وسلم ـ لەسەرەو ( مسلم ) گێڕاویەتەوە ، بڕوانە تەفسیری ( ابن کثير ) ج٢ ص ١٤٦ .
دەقی فەرموودەکەش ئەمەیە :
( إن اسرافيل قد التقم الصور وحنى جبهته ينتظر متى يُؤمر فينفخ ) واتە :
بەتەئکید ( ئیسرافیل ) کەڕەنای بەدەمەوە گرتووەو نێوچاوانی بەسەردا شۆڕکردۆتەوە ، چاوەڕێ دەکات کەنگێ فەرمانی پێ دەکرێ تاکو فووی پێدا بکات !

(2) لەو دیمەنانەی کە لە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی دا دێنەبەرچاو :
1ـ زیندووبوونەوەو هەستان و ڕاوەستانی مردووان و کۆبوونەوەیان لە گۆڕەپانی کۆبوونەوەدا .
( ثم نفخ فيه أخرى فاذا هم قيام ينظرون ) الزمر / ٤٨ .
وە ( فانما هي زجرة واحدة . فاذا هم بالساهرة ) .
النازعات / ١٣ ، ١٤ .
2ـ ڕاوەستانی جوبرائیل و فریشتەکانی دیکە, بەڕیزو بەبێ دەنگی مەگەر بەفەرمانی خودا .
( يوم يقوم الروح والملائكة صفا لايتكلمون إلاّ من أذِنَ لَهُ الرحمن .. ) النبأ / ٣٨ .

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

٣ـ دڵ لەرزین و چاو ئەبڵەق بوونی بێ بڕواو تاوانباران .
( قلوب یومئذ واجفة . أبصارها خاشعة ) النازعات/٨،٩ .
٤ـ دانرانی تەرازووی دادگەری خوا بۆ کێشانی چاکەو خراپان .
( ونضع الموازین القسط لیوم القیامة فلاتظلم نفس شیئا
وان کان مثقال حبة من خردل .. ) الأنبیاء / ٤٧ .
٥ـ وەرگرتنەوەی بڕواداران چاکەکار لیستەی کردەوانیان
بەدەستی ڕاست و بێ بڕواو تاوانباران بەدەستی چەپ .
( فأما من أوتي کتابه بیمینه فیقول هاؤم اقرأوا کتابیه .
إني ظننت أني ملاق حسابیه . فهو في عیشة راضیة ... وأما
من أوتي کتابه بشماله فیقول یالیتني لم أوت کتابیه .. ) .
( الحاقة / ١٩ إلى ٣٠ .
٦ـ ڕازێنرانەوەی بەهەشت و خۆشکردنی ئاگری دۆزەخ .
( وإذا الجحیم سعرت . واذا الجنة أزلفت ) التکویر /١٢،١٣ .
٧ـ وەڕێ کەوتنی بەندەکان بەتێکڕایی بۆ پەڕینەوە لە (صراط )
پردی سەرپشتی دۆزەخ و کەوتنەخوارەوەی تاوانباران و
ڕزگاربوونی پارێزکاران .
( وإن منکم إلا واردها کان علی ربک حتما مقضیا . ثم ننجي
الذین اتقوا ونذر الظالمین فیها جثیا ) مریم/٧١،٧٢ .

-٤-

# دیمەنی گۆڕەپانی کۆکردنەوەو لێپرسینەوە

ئنجا گۆڕەپانی ( الحشر والحساب ) سازدەکرێ و ڕۆژ هێندەی ( میل ) یێک لەخەڵکی وەنیزیک دەکەوێ و ، خەڵکی بەئەندازەی زۆری ی و کەمیی خراپەو تاوانەکانیان دەکەونە نێو گەرمیو ئارەقی لەشیانەوە ،(١) وە خەڵکی تێکڕا بەو شێوەیەی کە هاتوونە دنیاوە ـ واتە بەڕووتیو پێ خواسی و سوننەت نەکراوی ـ(٢) لە گۆڕەپانی ناوبراو لەبەردەم دادگای خوادا کۆدەبنەوەو ڕادەوەستن .(٣)

---

(١) پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم فەرموویەتی :
( لەڕۆژی دوایی دا ڕۆژ لەخەڵکی وەنیزیک دەخرێ هەتا هێندەی " میل " یێکی دەمێنێ ـ " سلیم " ی کوڕی " عامر " کە لە " مقداد " ەوە دەگێرێتەوە دەڵێ : بەخودا نازانم مەبەستی لە " میل " میلی ڕێ پێوانە " ١٦٠٩,٣٤ مەتر " یان کلچێوکی چاوپێ ڕشتنە ١ ـ جا ئەوجار خەڵک بەئەندازەی کردەوە ـ خراپەکانیان ـ لەئارەقێدا دەبن ، هەیانە تا گوێزینگانی دێ ، وە هەیانە تا ئەژنۆیانی دێ ، وە هەیانە تا کەلەکانی دێ ، وە هەیانە ئارەق جڵەوی دەکات )
( مسلم ) گێڕاویەتەوە .

(٢) ( يُحشر الناس يوم القيامة حفاةً عراةً غرلا ... ) متفق عليه عن عائشة رضي الله عنها .

(٣) ( يوم يقوم الناس لرب العالمين ) المطففين ) ٦ .
ئەو ڕۆژەی خەڵکی بۆ پەروەردگاری جیهانەکان ڕادەوەستن ـ و چاوەڕێ ی فەرمانیی دەکەن ـ .

وە لەورۆژەی دا خوای بێ وێنەو میهرەبان حەوت جــۆرە کەسان دەخاتە بن باڵی بەزەیی خۆیەوەو بەلوتفی خــۆی سێبەریان لێ دەکات و ، لە بەڵاو تەنگانەی ئـــەو ڕۆژە سەخت و دژوارە چەپاڵەیان دەدات .(١)

---

(١) سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظلّ إلاّ ظله : إمام عادل، وشاب نشأ في عبادة الله تعالى ، ورجل قلبه معلـــق بالمساجد ، ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتفرقــا عليه ، ورجل دعته إمرأة ذات منصب وجمال فقال إني أخاف الله ، ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لاتعلم شماله مــا تنفق يمينه ، ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه ) متفق عليه . واته :

حەوت کەس هەن کە خوا دەیانخاتە بن سێبەری خۆی لـــە ڕۆژێک دا کە جگە لە سێبەری وی چ سێبەری دیکە نین :

١ـ سەرۆکێکی دادگەر .
٢ـ وە گەنجێک کە فرچکی بە پەرستنی خوای بەرزەوە گرتوە .
٣ـ وە پیاوێک کە دڵی بە مزگەوتانەوە بەندە .
٤ـ وە دوو پیاو کە لەپێناوی خوادا یەکدی یان خۆشویستوە ، هەر لەسەر خۆشەویستی خوا کۆدەبنەوەو ، هەر بـــەو خۆشەویستیەشەوە لێک جیادەبنەوە .
٥ـ وە پیاوێک کە ئافرەتێکی خاوەن پایەو جوان بانگی دەکات ـ بۆ داوێن پیسی ـ ئەویش دەڵێ : من لەخوا دەترسم !
٦ـ وە پیاوێک کە خێرێک دەکات هێندە بە پەنهانی دەیکـات کە ئەگەر لای ڕاستی ببەخشێ لای چەپی پێی نازانێ !
٧ـ وە پیاوێک کە بەتەنێ یادی خوا دەکاتەوەو چاوی پڕدەبن لە ئاو .

# لەو ڕۆژەدا تاوانباران حاڵ و باڵیان چۆن دەبێ؟!

لەڕۆژی دوایی‌دا دادگەری و قەهرو تووڕەیی خودا جل جلالە لە تاوانباران وەخۆدەکەوێ و ، پاش حاشاکردن و دەستکردن بە درۆو دەلەسەو سوێندی بەدرۆ خواردن و بێ ئەدەبی نواندن ،(١) خوا مۆریان بەسەر زاری یەوە دەنێ و ، ئەندامەکانیان دێنێتەگۆو ، بە ئەندامەکانیان شایەدییان پێ لەسەرخۆ دەدات .(٢)

---

(١) ( یوم یبعثهم الله جمیعا فیحلفون له كما یحلفون لكم ویحسبون أنهم علی شيئ ألا إنهم هم الكاذبون ) المجادلة/١٨.
واتە : ئەو ڕۆژەی کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە ، جا - بۆ خۆقوتارکردن - سوێندی بۆ دەخۆن هەروەک چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن - بەدرۆ تا بڕوایان پێ بکەن - وە پێیان وایە کە لەسەر شتێک بوو ون - و هەقێکیان بەدەستەوەیە - ئاگاداربە ! ئەوانن درۆزنان .

(٢) أ- ( الیوم نختم علی أفواههم وتكلمنا أیدیهم وتشهد أرجلهم بما كانوا یكسبون ) یس/ ٦٥ . واتە : ئەمرۆ مۆریان بەسەر زاری یەوە دەنێین ، وە دەستیان قسەمان لەگەڵ دەکەن و ، لاقیان شایەدی لە کردەوەکانیان دەدەن .
ب- (( ڕۆژێکی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وآله وسلم پێکەنی‌و زەردەخەنەی هاتێ ، ئنجا فەرمووی : بۆ لێم ناپرسن لەبەرچی پێکەنیم ؟ گوتیان : ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی پێکەنی ؟ فەرمووی گفت‌وگۆی بەندەم پێ سەیربوو لە ڕۆژی

..........................................................

دواییدا لەگەڵ پەروەردگاری دا ، دەڵێ باشە پەروەردگارم ئەدی بەڵێنت نەداومێ کە ستەمم لێ نەکەی ؟ دەفەرموێ : با ، دەڵێ : دەجا من لە نەفسی خۆم بەولاوە بەهیچ شایەدێک قایل نیم ، ئنجا خوای خاوەن پیت و پێزو بەرز دەفەرموێ : ئایا من بەس نیم بۆ شایەدی ی وە فریشتە بەڕێزە نووسەرەکان بەس نین ؟! - پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام - فەرمووی : ئەویش - واتە بەندە - چەند جارێک داوایەکەی دووپات دەکاتەوە ، فەرمووی : ئنجا مۆر بەسەر زاری یەوە دەنرێ و ، ئەندامەکانی باسی ئەوە دەکەن کە کردوویەتی ، ئەویش پێیان دەڵێ : دووری ی و نەفرین لەئێوە بێ خۆ من لەسەر ئێوە دمبەدمەم دەکرد ! )) ٠

( مسلم ) و ( بزار ) و ( إبن أبي حاتم ) ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە ٠
بڕوانە :( مفردات القرآن ) ص ٤٧٨ ٠









# سەرنجدانێك لە دادگای دوا رۆژ

خوای بالادەست و میهرەبان تەرازووی دادگەری خۆی دادەنێ و چاكەو خراپەكانی پێ دەكێشرێن و گەردیلەیەكی گچكە چی‌یە لە چاكەو خراپە ون نابێ و دەخرێتەڕوو [1] ئنجا هەرچی لەو گۆڕەپانەدا خڕبۆتەوە - لێرەدا مەبەست بەس ئینسان و جندە - بەگوێرەی كردارو ڕەفتاری چاك یان خراپیان پاداشت یان سزایان بۆ دیاری دەكرێ و هیچ كەسێك هێندەی نووكی دەرزی یە ستەمی لێ ناكرێ . [2]

---

(١) ( ونضع الموازين القسط ليوم القيامة ، فلاتظلم نفس شيئا وإن كان مثقال حبة مِنْ خردل أتينا بها وكفى بنا حاسبين ) الأنبياء / ٤٧ .
واتە :
وە تەرازووە دادگەر - و ڕاست - ەكان لە ڕۆژی دوایی دا - بۆ هەڵسەنگاندنی كردەوەی بەندەكان - دادەنێین ، هیچ كەس تۆزە ستەمێكی لێ ناكرێ ، وە ئەگەر هێندەی دەنكە خەرتەلەیەك - چاكە یان خراپەی هەبێ - دەیهێنینە گۆڕێ ، وە ئێمە بەسین بۆ ژماردن و لێپرسینەوە .

( فَمَنْ يعمل مثقال ذرة خيرًا يره ، وَمَنْ يعمل مثقال ذرة شرًا يره ) الزلزال / ٧ ، ٨ . واتە :
جا هەركەسێك - هێندەی - قورسایی گەردیلەیەك چاكە بكات دەیبینێتەوە ، وە هەركەسێك - هێندەی - قورسایی گەردیلەیەك خراپە بكات دەیبینێتەوە .

(٢) ( وأشرقت الأرض بنور ربها ووضع الكتاب وجئ بالنبيين والشهداء وقضى بينهم بالحق وهم لايُظلمون ) الزمر / ٦٩ .
واتە :

# سەرەنجامی شووی تاوانباران لەرۆژی دوایی دا

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە لەڕۆژی دوایـی دا ڕازو نهێنیـیە پەنهان و شیرراوەکانی نێودڵان ئاشکرا دەبن و [(١)] مرۆڤ هیچ شتێکی لێ ون نابێ ،[(٢)] وە بڕوای وایە کـە بێ بڕواو تاوانباران ڕیسواو ڕووزەردو شەرمەزار دەبن و[(٣)]

---

(١) ( یوم تبلى السرائر ) الطارق / ٩ . واتە :
ئەو ڕۆژەی کە نهێنیـیەکان ئاشکرا دەبن .
(٢) ( یومئذ تعرضون لاتخفى منکم خافیة ) الحاقة / ١٨ .
واتە : لەو ڕۆژەی دا ڕادەنوێنرێن هیچ شتێکی ئێوە لەخوا پەنهان نیە .
(٣) ( وجوه یومئذ خاشعة ) الغاشیة / ٢ . واتە :
لەو ڕۆژەی دا چەند ڕوویێک کزو داماون .
( ووجوه یومئذ علیها غبرة . ترهقها قترة . أولئک هم الکفرة الفجرة ) عبس / ٤٠ ، ٤١ ، ٤٢ .
واتە :
وە چەند ڕوویێک هەن لەو ڕۆژەی دا تۆزو گەرد ـ ی خەم و پەژارە ـ یانێ لێ دەنیشێ ، دووکەڵی ڕەشی شەرمەزاری دایان دەگرێ ، ئەوانەن کافرانی تاوانبار .

---

............................................................

وە زەوی ـ گۆرەپانی حەشر ـ بەڕووناکی پەروەردگـاری درەوشایەوەو لیستە ـ ی کردەوان ـ دانراو پێغەمبەران و شاهیدان هێنران و بەڕاستی حوکمیان لەنێوان دا کـرا ، بێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ .

ڕوویان ڕەش دەبێو ،(١) دڵیان پڕدەبێ لە خەمو پەژارەو سەری دنیایەیان لێ وێک دێتەوەو ،(٢) مردنێ بەئاوات دەخوازن ،(٣) وە بە دادگەری ی خوا لە ئازارو ئەشکەنجەی بێ ئامانی دۆزەخدا گیرۆدەو گرفتار دەبن .(٤)

---

(١) ( ویوم القیامة تری الذین کذبوا علی الله وجوههم مسودة ... ) الزمر / ٦٠ . واته :
وە ڕۆژی قیامەتێ دەبینی ئەوانەی درۆیان دژی خودا کردوە ڕوویان ڕەش بووە .

(٢) ( یَوَدُّ المجرم لو یفتدي مِنْ عذاب یَوْمِئذٍ ببنیه . وصاحبته واخیه . وفصیلته التي تؤویه . ومَنْ في الأرض جمیعا ثم ینجیه ) المعارج / ١١ ، ١٢ ، ١٣ ، ١٤ . واته :
باوای تاوانبار حەزدەکات لە سزای ئەو ڕۆژەی منداڵەکانی بکاتە بەلاگێڕی خۆی ، وە هاوسەرەکەی و براکەی ، وە ئەو تیرەیەی کە دەیگرێتەخۆی ، وە هەموو ئەوانەی لەسەر زەوی هەن تێکرا ، بەس ڕزگاری بێ .

(٣) ( ویقول الکافر یالیتني کنت ترابا ) النبأ / ٤٠ .
واتە : وە کافر دەڵێ خۆزگە گڵ بوومایە .

(٤) ( .. فالذین کفروا قطعت لهم ثیاب مِن نار . یُصَبُّ مِنْ فوق رؤسهم الحمیم . یصهر به ما في بطونهم والجلود . ولهم مقامع من حدید . کلما أرادوا أنْ یخرجوا منها مِنْ غم أعیدوا فیها وذوقوا عذاب الحریق ) الحج / ١٩ - ٢٢ .
واتە :
.. جا ئەوانەی بێ بڕوا بوون لە ئاگر پۆشاکێکی تایبەتیان * بۆ دەبڕێ . ئاوی داغیان بەسەر تەپڵی سەردا دەکرێ . پێستیان و هەرچی لەنێو زگیان دایە پێی دەتوێتەوە . وە گورزو قەمچی ئاسنین - بۆ لێدان - یان هەیە . هەرکاتێک ویستیان لەبەر خەمو پەژارە لێی بچنەدەرێ دەگێڕرێنەوە نێوی ، وە - پێیان دەگوترێ - بچێژن ئازاری سووتێنەر !!
تێبینی :
ئەمە بەس دیمەنێکە لە دەیان دیمەنی بەزەزاو سامناکی ژیان و گوزەرانی بێ بڕواو گوناحباران لەنێو دۆزەخدا .

---

* ئەو پۆشاکە تایبەتییە بە ... ( ... ) دا چاکتر

....................................................................

روون کراوەتەوە : کە دەفەرموێ :
( وترى المجرمين يومئذ مقرنين في الأصفاد . سرابيلهم من قطران وتغشى وجوههم النار ) / ٤٩ ، ٥٠ .
واتە :
وە لەو ڕۆژ ـ ى دوایی یـ ـەدا تاوانباران دەبینی کە ـ دەست و لاقیان یان دەست و گەردنیان ـ لە کۆت و زنجیردا جووت کراون . پۆشاکیان لە قەتران ـ یان مسی قالکراوەیـ ـە وە ئاگر دەم و چاویان دادەپۆشێ .

تێبینی :
هەرکام لە وشەی ( مقرنین ) و ( أصفاد ) و ( قطران ) بەپێی تەفسیرو لێکدانەوەی ( ابو جعفر الطبري ) لێکدراونەوە .
بڕوانە ( مختصر تفسیر الطبري ) ص ٢٩٠ .

# سەرەنجامی بەختەوەرانەی چاکەکاران

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە لەڕۆژی دوایی دا مسوڵمانانی چاکەکار دڵخۆش و ڕووگەش دەبن و ، (١) ڕوویان سپی دەبێ و ، (٢) لە ڕەنج و تێکۆشانی ژیانی دنیایان ڕازی دەبن ، (٣) وە بەچاکەو لوتفی بێ سنووری خوا لە باغ و کۆشکە ڕازاوەو پڕ نازو نیعمەتەکانی بەهەشت دا نیشتەجێ دەبن . (٤)

---

(١) ( وجوه يومئذ مسفرة . ضاحكة مستبشرة ) عبس / ٣٨ ، ٣٩ .
واتە : لەو ڕۆژەی دا چەند ڕوویێک هەن گەش و ڕوونن ، زار بەپێکەنینن ، دڵخۆشن .

(٢) ( يوم تبيض وجوه وتسود وجوه ... وأما الذين ابيضت وجوههم ففي رحمة الله هم فيها خالدون ) آل عمران / ١٠٦ ، ١٠٧ .
واتە : ئەو ڕۆژەی کە هەندێک ڕوو سپی دەبن و هەندێک ڕوو ڕەش دەبن ... وە ئەوانەی کە ڕوویان سپی بووە ئەوە لەنێو ڕەحمەت و نازو نیعمەتی خوادان ، تێیدا دەمێننەوە .

(٣) ( وجوه يومئذ ناعمة . لِسَعْيِها راضية ) الغاشية / ٨ ، ٩ .
واتە : لەو ڕۆژەی دا چەند ڕوویێک هەن گەشن ، لە ڕەنج و هەوڵدانی خۆیان قایلن . ( واتە پێ خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕن سەبارەت بە ژیانی دنیایان کە بەهۆی شوێن کەوتنی بەرنامەی خواوە بەشێوەیەکی وا گوزەراندوویانە لە تاقیکردنەوەی خوا دەربچن و پاداشت و ڕەزامەندی ی خوا دەستگیر بکەن ، کە لە ژیانی پڕ نازو نیعمەتی هەمەجۆرە و بێ سنوورو نەبڕاوەی بەهەشتی بەرین و ڕازاوەدا خۆی دەنوێنێ ) .

(٤) ( وما تجزون إلا ما كنتم تعملون . إلّا عباد الله المخلصين . اولئك لهم رزق معلوم . فواكه وهم مكرمون . في جنات

..................................................

النعيم . على سرر متقابلين . يطاف عليهم بكأس من معين . بيضاء لذة للشاربين . لافيها غول ولاهم عنها ينزفون . وعندهم قاصرات الطرف عين . كأنهن بيض مكنون ) . الصافات / ٣٩ – ٤٩ .

واته :

وە بەس بەپێی ئەوەی کە کردووتانە – ئەی بێ بڕواینە ! – سزا دەدرێن ، بێجگە لە بەندە هەڵبژاردەکانی خــوا ئەوانە ڕۆزی یەکی تەرخان کراویان هەیە ، میوەجـات – یان بۆ ئامادە کراوە – وە ئەوان ڕێز لێ گیراون . لە باغە پڕ نازو نیعمەتەکان دا . لەسەر تەختان ڕووبەڕووی یەکتر – دانیشتوون – پەرداخی پڕکراو لە سەرچاوەیــان بەسەرەوە دەگێڕرێ . سپی و بەلەززەتە بۆ خۆرەوانی . هیــچ زیانێکی – وەک سەرئێشە پێ گرتنی – تێدا نیە ، وە بیـرو هۆشیان پێی لاناچێ . وە چەند ئافرەتێکی چاوگەش و گەورەیان لەلان کە سەرنج و هۆشیان – لەسەر مێردەکانیان – کــورت هەڵێناوە . هەردەڵێی گەوهەری نێو سەدەف – یان هێلکــەی شاررا وە – ن . *

---

* لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەچەند نوکتەیەکــی وردی قورئانی بکەم ، کە لەم ئایەتە بەپێزانەدا دەبینرێن:

١– لە ئایەتی ژمارە (٣٩) دا بە تاوانباران گوتراوە کــە ( بەس بەپێی کردەوەکانتان سزا دەدرێن ) ئەم یاسایە کــە لەچەند جێیەکی دیکەش دا ڕاگەیەنراوە ، بۆ وێنە ( وجزاء سيئة سيئة مثلها .. ) الشورى / ٤٠ ، يان ( ومن جــاء بالسيئة فلايجزى الذين عملوا السيئات إلاّ ماكانوا يعملون) القصص / ٨٤ ، ئەوپەڕی دادگەری و کاربەجێیی خوای دادگەری تێدا دەردەکەوێ ، کە بەس بەئەندازەی تاوان ســزای بەندەکانی دەدات .

٢– ئایەتی ژمارە (٤٠ ) کە لە حوکمی ئایەتی پێشــەوە هەڵاوێرراو ( مستثنى ) ە ، ئەوە دەگەیەنێ کە خوای خاوەن لوتف و بەزەیی لەبەرانبەر چاکەی چاکەکاران دا یاسایەکــی دیکە بەکاردێنێ ، کە بریتیە لە پاداشت و چاکەدانــەوە بە زیاترو چاکتر لە کرێ و پاداشتی چاکەکان ، لەوبارەشەوە ئایەت زۆرن بۆ وێنە :( من جاء بالحسنة فله خير منها ..) القصص / ٨٤ .

دیسان هەر لەم ئایەتە دەفامرێتەوە کە ئەوانەی لەئەنجامی خواناسیو چاکەکاری دا بە بەهەشتی بەرین شاد دەبن، کەسانێکن خوا هەڵی بژاردوون، بەواتایەکی دیکە ئەوانە کەسانێکن کە بەرلەوەی ئەوان هیچ چاکەیەکیان لێ هەڵبوەرێ، خوا چاکەی لەگەڵ کردوون و هەڵی بژاردوون، وە لەڕاستیدا چاکە پێکرانەکەشیان هەر بەرهەمو ئەنجامی چاکەو لوتفی خودایە.

٣- لە ئایەتی ژمارە (٤١) یشدا کە فەرموویەتی: (رزق معلوم) مەبەست ڕۆزی یەکی سنووردارو کەم نیە، بەڵکو مەبەست ڕۆزی یەکی تەرخان و دیاری کراوە کە تایبەتە بەو بەندە هەڵبژاردنەوەو کەسی دیکە بەشی پێوە نیە.

٤- لە ئایەتی ژمارە (٤٢) شدا کە وێڕای (فواکه) باسی (إکرام) یش کراوە، نازو نیعمەتی ماددی و مەعنەوی ڕەچاو کراون.

٥- لە ئایەتی ژمارە (٤٤) یش وەردەگیرێ کە ئەوەی لەنێو خەڵکی سادەو عەوامدا باوە، کە گوایە لە بەهەشتێ کەس جێگاو ڕێگای کەس نابینێ و، ئەگەر بیانەوێ یەکتر ببینن لە نیوەی ڕێ بە دەگەنە یەک و هەرکەسەیان دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی! ئەفسانەیەکی پووچەو بەهەشتییەکان پێکەوە کۆدەبنەوەو لەسەر کورسیو تەختی بەرزو ڕازاوە (وفرش مرفوعة) الواقعة/٣٤. ڕووبەڕووی یەکتر دادەنیشن!

٦- لە ئایەتی ژمارە (٤٦) یش دەفامرێتەوە کە خۆراکی بەهەشتێ هەم دیمەنیی و هەم ماهیەتیی لەوپەڕی تەواوی دایە، چونکە لەڕووی ڕەنگ و دیمەنەوە بە (سپی) یەتی وەسف کراوە کە پاکترین و بێگەردترین ڕەنگە، وە لەڕووی ماهیەتەوە بە تام و چێژ (لەززەت) ی رووت وەسف کراوە!

٧- لە ئایەتی ژمارە (٤٧) یشدا بەشێوەیەک وەسفی ئەو خۆراک و شەرابە کراوە کە بەپێچەوانەی ئی دنیاوە دوورە لەوەی کە ببێتە مایەی نەخۆشی یان بێ هۆشی!

٨- وە لە ئایەتی ژمارە (٤٨) یشدا کە ئافرەتە بەهەشتییەکان بە (قاصرات الطرف) وەسف کراون مەسەلەیەکی دەروونی یەکجار گرنگ لە پیاودا ڕەچاوکراوە، ئەویش ئەوەیە کە پیاو - بەمەرجێک سروشتیی دووچاری لادان (إنحراف) نەبووبێ - حەز ناکات کە هاوسەرەکەی جگە لەخۆی هیچ کەسی

دیکەی هەر بەخەیاڵیش دا بێت، چ جای سەرنجی ڕابکێشێ!
جا لەم ئایەتەدا ڕاگەیەنراوە کە ئەو ئافرەتانە خاوەنی
ئەو ڕەوشت و خووە بەرزەن کە مایەی ئاسوودەیی خەیاڵی
پیاوو بەختەوەری خێزانیشە !!

٩- دیسان لە ئایەتی ژمارە (٤٩)ش دا کە ئافرەتە مێردپەروەر
ـەکانی بەهەشت وەکەوهەری نێو سەدەف یان هێلکەی
شاراوەی نێو هێلانە چوێنراون، ئاماژە بۆئەوە کراوە کە
ئەو ئافرەتە دڵگیرو چاوگەشانە وێڕای ئەوەی کە بۆخۆیان
جگە لە مێردەکانیان بیر لەکەسی دیکە ناکەنەوەو، سەرنجی
هیچ کەس نادەن، هێندەش بەشەرم و شکۆو خۆپارێزو بەڕێزن
ڕێگا بەهیچ کەسیش نادەن کە بیانبینێ و سەرنجیان بدات،
چونکە جگە لە مێردەکانیان خۆیان بەحەڵاڵی کەسی دیکە
نازانن، ئنجا شایانی باسە کە ئەم جۆرە وەسفانە وێڕای
ئەوەی کە وەزع و چۆنیەتی ژیانی بەهەشت دەخەنەڕوو، بە
شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش هانی پیاوو ئافرەتانی موسڵمان
دەدەن کە خۆیان بەو ڕەوشت و ئاکارە بەرزو پەسەندو
بەهەشتییانە بڕازێننەوە.

# لێك هەڵاوێردانی پاك و پیسان

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە پاش کێشران و هەڵسەنگێنرانی چاکەو خراپان و ، وەرگرتنەوەی لیستەی کردەوان ، خوای بەخشندە بەگوێرەی ئەندازەی بڕواو کرداری چاك ڕووناکی بەمسوڵمانان دەبەخشێ و ، لەبەر تیشکی ئەو ڕووناکی‌یەدا بەرەو بەهەشت دەڕۆن و ، بێ بڕواو مونافیق و تاوانبارانیش کە دەیانەوێ بەرەو بەهەشت بکەونەڕێ دەکەونە نێو تاریکی‌یەکی ئەنگوستەچاوەوەو سەرگەردان دەبن ، چونکە لە ژیانی دنیایان دا هێندە بڕواو کردەوەی چاکیان نەبووە ، کە لەدوا ڕۆژدا بۆیان ببێتە ڕووناکی و پێی بگەنە ئامانج . (١)

---

(١) ( يوم ترى المؤمنين والمؤمنات يسعى نورهم بين أيديهم وبأيمانهم بشراكم اليوم جنات تجري مِنْ تحتها الأنهار خالدين فيها ذلك هو الفوز العظيم . يوم يقول المنافقون والمنافقات للذين آمنوا انظرونا نقتبس من نوركم ، قيل ارجعوا وراءكم فالتمسوا نورا ، فضرب بينهم بسور له باب باطنه فيه الرحمة وظاهره من قبله العذاب . ينادونهم ألَمْ نكن معكم ؟ قالوا بلى ولكنكم فتنتم أنفسكم وتربصتم وارتبتم وغرتكم الأماني حتى جاء أمر الله وغركم بالله الغرور . فاليوم لايؤخذ منكم فدية ولا مِنَ الذين كفروا مأواكم النار هي مولاكم وبئس المصير ) الحديد / ١٢ - ١٥ .
واتە :
ئەو ڕۆژەی کە پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار دەبینی ڕووناکی - بڕوا - یەکەیان لەپێشیانەوە دەڕوات و بەدەستی

راستیانەوەیە ـ پێیان دەگوترێ ـ ئەمڕۆ مۆژدەتان لێ بێ بەچەند باغێک کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن بەهەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە ، هەر ئەوە بردنەوەی مەزنە .

ئەو ڕۆژەی کە پیاوان و ئافرەتانی دەغەڵ بەوانە دەڵێن کە بڕوایان هێناوە : چاوەڕێمان بکەن بۆئەوەی لە ڕووناکی ئێوە وەربگرین ! ـ پێیان ـ گوترا : بگەڕێنەوە دوایە (ژیانی دنیا یان مەیدانی لێپرسینەوە) لەوێ ڕووناکی پەیدابکەن . ئنجا دیوارێکیان لەنێوان دا دانرا ، دیوی ژوورێ ی خێروخۆشییەو لەلای دیوی دەرەوەشییەوە ئازار هەیە .

بانگیان دەکەن ـ ئەی مسوڵمانینە ـ مەگەر ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبووین ـ لەدنیادا ـ ؟! گوتیان : با ، بەڵام ئێوە ـ بەهۆی نیفاقەوە ـ خۆتان فەوتاند . وە ـ بۆ بڕواداران ـ لەکەمین دابوون . وە هەر دوودڵ بوون ، وە خولیاو ئاوات ـ ە پووچ ـ ەکان فریویان دان . هەتا فەرمانی خوا هات وە لەبارەی خواوە ـ شەیتانی ـ فریودەر فریوی دان .

ئنجا ئەمڕۆش بەلاگێڕدەوە نە لەئێوەو نە لەوانەی بێ بڕوان وەرناگیرێ ، جێگای سەقامگیربوونتان ئاگرە ، ئەو پشتیوانتانە ، وە ئەوەش خراپترین سەرەنجامە .

# تكا (شفاعة) كردنى پێغەمبەران
## عليهم الصلاة والسلام

مرۆڤى مسوڵمان بڕواى وايە كە لەڕۆژى دوايى دا لە گۆڕەپانى كۆكردنەوەو لێپرسينەوەدا پێغەمبەران و زانايان ـ ى ڕاست و ساغ ـ و شەهيدان تكاى لێبوردن و بەخشين بۆ تاوانباران لەخوا دەكەن ، هەركەسە بەپێى توانای خۆی [١]

وە پێغەمبەرمان ( محمد ) عليه الصلاة والسلام ئەوداوا تايبەتى‌يەى خۆى كە خودا پێى بەخشيوە وەک چۆن داوايەكى تايبەتى بە هەركام لە پێغەمبەرانى ديكە عليهم الصلاة والسلام بەخشيوە ، هەڵى گرتوە بۆ ڕۆژى دوايى تاكو تكاو ڕەجاى پێ لەخوا بكات بۆ تاوانبارانى ئوممەتى [٢] وە پێغەمبەرى ئێمە عليه الصلاة والسلام يەكەم كەس دەبێ كە تكا دەكات و تكايەكەشى وەردەگيرێ . [٣]

---

(١) ( يشفع يوم القيامة ثلاثة ، الأنبياء ثم العلماء ثم الشهداء ) رواه ابن ماجة .

(٢) ( لكل نبي دعوة قد دعاها لِأمته وإني اختبات دعوتي شفاعة لِأمتي يوم القيامة ) رواه الشيخان .

(٣) ( ... ولكن انطلقوا إلى عيسى بن مريم فانه كان يبرئ الأكمه والأبرص ويحيي الموتى فيقول عيسى ليس ذاكم عندي ولكن انطلقوا إلى سيد ولد آدم فانه أول من تنشق عنه الارض يوم القيامة ، انطلقوا إلى محمد صلى الله عليه وسلم فليشفع لكم إلى ربكم ، قال فينطلقون فيأتي جبريل ربه فيقول ائذن له وبشره بالجنة ... ) رواه أحمد وابو يعلى

....................................................................

والبزار وابن حبان .
بروانه ( الزواجر عن اقتراف الكبائر ) ابن حجر الهيتمي ج۲ ص ۲۰۷ .

تێبینی :
پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم بەس دەتوانێ تکا بۆ کەسانێک بکات کە ئۆممەتی وی بووبن و مەرجەکانی مسوڵمانەتی یان تێدا بووبن .

بۆ زانینی مەرجەکانی مسوڵمانەتییش واچاکە تەماشای ( کۆمەڵی خوا ) و ( مسوڵمانێی کامل ) بکرێ ، کە یەکەمیان ئاڵقەی نۆیەم و دووەمیان ئاڵقەی دوازدەیەمی ئەم زنجیرەیەیە .

# چۆنیەتی ڕەت بوون بەسەر پردی سەرپشتی دۆزەخدا

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە هەموو ئینسانێک چاک بێ یان خراپ حەتمەن دەبێ بەسەر پردی سەرپشتی دۆزەخدا ڕەت بێ، جا ئەوانەی بڕوادارو پارێزکار بووبن ، هەرکەسە بەئەندازەی بڕواو کردەوەی چاکی خۆی بەسەری دا ڕەت دەبێ ، واتـــــە مرۆڤی مسوڵمان و خواناس خێرایی تێپەڕبوونی بەسەر پـــردی دۆزەخدا بەپێی پتەوی بڕواو زۆری کردەوە چاکەکانی یەتـی، وە ئەوانەی بێ بڕواو لاڕێ و یاخی بوو بووبن ، ناتوانـــن بەسەر پردی گۆڕبین دا وەپەڕن و ، لەسەری سەرەنگرێ دەبن و سەرەوبن دەکەونە نێو ئاگری دۆزەخەوە .(١)

---

(١) خوای زانا لەوبارەوە فەرموویەتی :
( وإن منکم إلا واردها کان علی ربک حتما مقضیا . ثـــم ننجي الذین اتقوا ونذر الظالمین فیها جثیا ) .
مریم / ٧١ ، ٧٢ . واتە :
وە هیچ کام لە ئێوە نیە کە نەچێتە دۆزەخەوە – مەبەست پەڕینەوەیە لە پردی دۆزەخ – پەروەردگارت بڕیاری کۆتایی لەسەر داوە . دوایی ئەوانەی کە پارێزکار بوو ون ڕزگاریان دەکەین و ستەمکاران لەسەر چۆکان لەوێ دا بەجێ دێڵین .

تێبینی :
ئەم دوو ئایەتە خاوەنی ( جامع البیان ) یـــــش وەک ئێمەی لێکداونەوە .
بڕوانە ( جامع البیان ) ج١٦ ص ٨١ – ٨٧ . ( طبري ) .

پێغەمبەریش علیە الصلاة والسلام ئاوا باسی چۆنیەتـــی

........................................................................

پەرینەوە لەپردی دۆزەخ دەکات :

(( پرد بەسەر نێوەڕاستی دۆزەخدا رادەهێشترێ ، وەکو دمی شمشێری تیژ وایە ، لووسەو لەسەرێ هەڵدەخلیسکێ ، قولابی ئاگرینی لەسەرن ، خەڵکیان پێ دەگرێ ، جا هەرچی بیگرێ دەکەوێتەخوارو لەخۆدەچێ ، وە هەیانە وەکو تیشک رادەبرێ ، ئەوە تێ نائاڵقێو قوتاری دەبێ ، دوای ئەوە هەیە وەک با دەڕوات ، ئەویش نائاڵقێو قوتاری دەبێ ، دوایی هەیە وەک غاردانی ئەسپ ، دوایی وەک غاردانی ئینسان ، دوایی وەک نەرمەغاری ئینسان ، دوایی وەک ڕۆیشتنی ئینسان )) .

رواه الطبراني عن ابن مسعود .

# تێراو بوونی ئوممەتی (محمد) لە سەرچاوەی کەوثەر

پاش ئەوەی مسوڵمانان بەسەر پردی سەرپشتی دۆزەخ دا ڕەت دەبن و لە مەترسی ئاگری دۆزەخ قوتار دەبن ، لە سەرچاوەی ( کوثر ) دەخۆنەوە ، ( کوثر ) یش ناوی ئەو کانیاو و سەرچاوەیەیە کە خودا بە پێغەمبەری ئێمەی بەخشیوە لە بەهەشتی بەرین دا ، ئەو سەرچاوەیەش لە پێش هەموو کەس دا مسوڵمانە کۆچکەرە نەدارەکان ( فقراء المهاجرين ) لێی دەخۆنەوە .(١)

وە ئەو سەرچاوەیە ئاوەکەی لە زیوی سپی ترەو ،(٢) لە هەنگوینی شیرین ترەو ، لە عەتری بۆن خۆش ترەو ،(٣) ئەو پەرداخانەی کە لەسەر قەراغەکانی دانراون بۆ ئاوخواردنەوە هێندەی ئەستێرەکانی ئاسمانی دەبن .(٤)

وە سەرچاوەی ناوبراو گۆشەکانی وەک یەکن و ، هەتا چاو بڕبکات پان و بەرینە !(٥) وە هەرکەسێک جارێک لە

---

(١) فەرموودەیەکە ( ئیمامی ئەحمەد ) خوا لێی خۆش بێ گێڕاویەتەوە / ( الزواجر ) ج٢ ص٢٠٥ .
(٢) بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە /( الزواجر ) ج٢ ص٢٠٤ .
(٣) ( أحمد ) گێڕاویەتەوە / ( الزواجر ) ج٢ ص٢٠٥ .
(٤) ( أحمد ) گێڕاویەتەوە / هەمان سەرچاوەی پێشوو .
(٥) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە .
بڕوانە ( الزواجر ) ج٢ ص٢٠٤ .

حەوزی کەوثەر بخواتەوە قەت تینووی نابێتەوە .(١)

---

(١) ( أحمد ) گێڕاویەتەوە .

بڕوانە ( الزواجر ) ج٢ ص ٢٠٥ .

کردنەوەی گرێ کوێرەیەک :

ڕەنگە یەکێک بپرسێ :
باشە مادام پاش ئاوخواردنەوە لە حەوزی پێغەمبەر صلى الله عليه وآله وسلم مسولمانان تینوویان نەبێتەوە ، ئەدی ئەو هەموو ڕووبارانەی شیرو هەنگوین و شەراب و چی و چی‌یە سوودیان چی یە ؟!
لەوەڵام دا دەڵێین :
خواردن و خواردنەوەکانی بەهەشت هیچیان بۆ باباسای برسی و تینوو و حاڵ شەپرێو نین ، بەڵکو بەس بۆخۆشی و لەززەتن ، وەک چۆن تۆ پەرداخێک ( شەربەت ) یان کەوچکێک ( دۆ ) دەخۆیەوە بێ ئەوەی هەست بە تینوایەتی بکەی !!
یاخود قاپێک ( محەللەبی ) یان ( پاقلاوەو شیرینی ) دەخۆی بێ ئەوەی هەست بە برسیەتی بکەی !

# ئەنجامی کۆتایی ڕۆژی دوایی

لەکۆتایی دا مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە ئەنجام و کۆتایی ڕۆژی دوایی بریتیە لە نیشتەجێ بوون و سەقامگیر بوونی بڕواداڕانی پەسند ئاکارو چاک ڕەفتار لەنێو بەهەشتە ڕازاوەو سەرسووڕهێنەرەکانی خوادا ،(١) کە هەرچی دڵیان بیخوازێ لە نازو نیعمەتی ماددیومەعنەوی تێیان دا هەیە(٢)! وە جێگیربوونی بێ بڕواو مونافیق و تاوانباران لەنێو ئاگری بەگڕو کڵپەی دۆزەخی بێ ئامان دا(٣) ، کە هەموو

---

(١) ( إنّ الذين آمنوا وعملوا الصالحات كانت لهم جنات الفردوس نزلا . خالدين فيها لايبغون عنها حِوَلا ) الكهف / ١٠٧ ، ١٠٨ . واتە :
ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە لەنێو باغەکانی فیردەوس دا – کە بەرزترین جێی بەهەشتە – نیشتەجێ دەبن . تێیان دا دەمێننەوە ، نایانەوێ لێیان بچنە دەرێ .

(٢) ( وفيها ماتشتهيه الأنفس وتلذ الأعين وأنتم فيها خالدون ) الزخرف / ٧١ . واتە :
وە هەرچی نەفس ئارەزووی بکاو چاو چێژی لێ وەربگرێ تێیدایە ، وە ئێوە تێیدا دەمێننەوە .

(٣) هەڵبەتە نیشانەی ڕازی بوونی خودا لە ئینسان بریتیە لە چوونە نێو بەهەشتی بەرین و چەپاڵەدران لە ئاگری سووتێنەری دۆزەخ ، وە نیشانەی تووڕەبوونی خودا لە ئینسان بریتیە لە چوونە نێو دۆزەخی بەتین و بێ بەش بوون لە نازو نیعمەتی بەهەشت .
هەربۆیەش بەرزترین و گەورەترین ئامانجی مرۆڤ لەژیانی

جۆرە ئازارو ئەشکەنجەیەکی ماددی و مەعنەوی لێ یە . (١)

ئنجا دوای نیشتەجێ بوونی مسوڵمان و خواناسانی ڕاستەقینە لە بەهەشتی بەرین داو ، بێ بڕوایانی بەدڕەفتار لە دۆزەخی بەتین دا ، بڕواداران دەست دەکەن بە سوپاس کردنی خوداو سەلام لەیەکدی کردنی پەیتا پەیتا ، (٢)

........................................................................

دنیای دا بریتیە لە گەیشتن بە ڕەزامەندی خودای بەخشندەو پارێزران لە تووڕەیی و غەزەبی خودا ، چونکە هەرکەسێک خوا لێی ڕازی بێ ، خۆشی و بەختەوەری نەبڕاوەو هەتا هەتایی بەقسمەت دەبێ ، وە هەرکەسێک خوا لێی قەڵس بێ و لێی ناڕازی بێ ، سزاو جەزرەبەی لەتوانابەدەرو هەمیشەیی تووش دەبێ .

(١) (إن المجرمين في عذاب جهنم خالدون . لايفتر عنهم وهم فيه مبلسون) الزخرف / ٧٤ ، ٧٥ . واتە :
بەڕاستی تاوانباران لەسزای دۆزەخ دا دەمێننەوە ، لەسەریان سووک نابێ و تێیدا بێ هیواو تەمابڕاو دەبن .

(٢) (وقالوا الحمد لله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدي لولا أن هدانا الله لقد جاءت رسل ربنا بالحق ونودوا أن تلكم الجنة اورثتموها بما كنتم تعملون) الاعراف / ٤٣ .
واتە : وە ـ بەهەشتی یەکان ـ گوتیان : سوپاس بۆ خوایەی کە ڕێنمایی کردووین بۆ گرتنی ڕێ یەک کە بمان گەیەنێ بەم ـ بەهەشتـ ـە ، وە ئەگەر خوا ڕێرووونی نەکردبایەن نەمان دەتوانی ڕێ ی ڕاست بگرین ، بەڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان هەقیان هێنابوو ، وە بانگ کران کە ئەم بەهەشتەتان بەهۆی کردەوەکانتانەوە دەستتان کەوتوە .

(دعواهم فيها سبحانك اللهم وتحيتهم فيها سلام وآخر دعواهم ان الحمد لله رب العالمين) يونس / ١٠ . واتە :
دووعایان لەوێ دا بریتیە لە (ئەی خوایە پاکیی بۆتۆ) وە سڵاوکردنیان بریتیە لە (سەلام کردن) ، وە دوایین دووعایان ئەوەیە کە سوپاس بۆخوای پەروەردگاری جیهانەکان .

بێ بڕوایانی نەگبەت و بێ خێریش دەست دەکەن بە چەقەچەق و دمبەدمەو هەرکامێکیان ئەوی دیکە تاوانبار دەکات و ، (١)
دەیەوێ پاکانە بۆخۆی بکات و خۆی لە لۆمەو سەرکۆنەی خودا ڕزگاربکات ، وە ئەوانەی کە لەدنیادا ڕابەرو سەرکردەی بێ بڕوایی و خراپەکاری بوو ون لەو ڕۆژەی دا بەری بوونی خۆیان لە شوێن کەوتووانیان دەردەبڕن و یەخەیان لەبەر دادەدڕن ، (٢) تەنانەت شەیتانیش کە گەورەترین پێشەواو

---

(١) ( واذ يتحاجون في النار فيقول الضعفاء للذين استكبروا إنّا كنا لكم تبعا فهل أنتم مغنون عنا نصيبا من النار . قال الذين استكبروا إنا كل فيها إنّ الله قد حكم بين العباد ) غافر / ٤٧ ، ٤٨ . واته :
وە کاتێک کە لەنێو ئاگری دا دمبەدمەی دەکەن ، بێ دەستەلاتەکان بە خۆبەزل زانەکان دەڵێن : ئێمە شوێن کەوتووی ئێوە بووین ، ئایا ئێوە تۆزێک لە سزای ئاگرمان لێ ناگێڕنەوە ، خۆبەزل زانەکان دەڵێن : ئێمە هەموومان لەدۆزەخ داین ، خوا حوکمی لەنێوان بەندەکان دا کردوە .

(٢) ( إذْ تبرأ الذين اتبعوا من الذين اتبعوا ورأوا العذاب وتقطعت بهم الأسباب ) البقرة / ١٦٦ . واته :
کاتێک کە سەرکردەو پێشەواکان یەخەیان لەبەر شوێن کەوتووەکانیان دادڕی ، وە ئازاری دۆزەخیان دی و دەستیان لە هەموو پچکان بڕان .
( وقال الذين كفروا ربنا أرنا الذَين أضلانا مِنَ الجن والأنس نجعلهما تحت أقدامنا ليكونا مِنَ الأسفلين ) . فصلت / ٢٩ . واته :
وە ئەوانەی کە کافرن گوتیان : پەروەردگارمان ئەوانەمان پێشان بدە لە جندو ئینسان کە گومرایان کردین تاکو بیانخەینە ژێر پێ مانەوە بۆئەوەی زەبوون بن .

سەرکردەی بێ بڕواو تاوانبارو یاخی بووانە ، لــەوێ دا لۆمەو سەرکۆنەی شوێن کەوتووانی دەکات و پێیان دەڵــێ سووچی خۆتانە واتان بەسەرهاتووەو دادگەری خــــــودا ڕادەگەیەنێ . (١)

---

(١) ( وقال الشيطان لمّا قضي الأمر إنّ الله وعدكم وعــد الحق ووعدتكم فأخلفتكم وما كان لي عليكم من سلطان إلاّ أن دعوتكم فاستجبتم لي فلا تلوموني ولوموا أنفسكــم ما أنا بمصرخكم وما أنتم بمصرخيّ إني كفرت بما أشركتموني من قبل إن الظالمين لهم عذاب أليم ) إبراهيم/ ٢٢ .
واتە :
وە دوای ئەوەی هەموو شتێک برایەوە ـ بەهەشتیــان لە بەهەشتێ داو دۆزەخیان لە دۆزەخێ دا جێگیربــوون ـ شەیتان گوتی : خودا بەڵێنی ڕاستی پێ دابوون و منیــش گفتم پێ دابوون ، بەلام گفتم نەبردەسەر ، وە من هیــچ دەستەلاتم بەسەرتان دا نەبوو ، ئەوەندە نەبێ کە بانگـم کردن ئێوەش بەدەنگمەوە هاتن ، کەواتە گلەیی لە مــن مەکەن و لۆمەی خۆتان بکەن ، نە من دەفریای ئێوە دێم ، نە ئێوە دەفریام دێن ، من نارازیم بەوەی کە لەمەوبەر منتان کردبوو بە هاوبەشی خودا ، بەڕاستی ستەمکــاران ئەشکەنجەی بەئازاریان هەیە .

تێبینی :
دەگونجێ ئەم ڕستەیەی دوایی ( إن الظالمين لهم عذاب أليم ) هەر قسەی شەیتان بێت و لەو ڕۆژەدا بەڕاشکــاوی دانی بەوەدا بێنێ ، کە هەرچی غەیری خوا بپەرستێ و لە فەرمانی خوا دەربچێ ستەمکارو خراپەکارە ، وە ڕێشی تێدەچێ کە فەرموودەی خوا بێت و بیەوێ لەکۆتایی دا مۆری ستــەم ( ظلم ) بەپێڕی شەیتانەوە بنێ ، دیارە وشەی ( ظلم )یــش هەرچەندە بە عورف زیاتر دەست درێژی بۆ سەر غەیــر دەگەیەنێ ، بەلام لەزاراوی قورئان دا هەموو جـــــۆرە تاوان و خراپەیەک دەگرێتەوە چ پەیوەندی بەخواوە بێت ،

وەک ها وبەشی پەرستی ( .. إن الشرک لظلم عظیم )لقمان/١٣.
وە چ پەیوەندی بەخەڵکەوە هەبێ ( .. الذین یظلمون الناس ویبغون في الأرض .. ) الشوری / ٤٢ . وە چ بەزاتی ئینسان خۆیەوە : ( .. فلاتظلموا فیهن أنفسکم ... ) .
التوبة / ٣٦ .

وشەی ( ظلم ) یش لەئەسڵی زمانی عارەبی دا بریتییە لە دانانی شتێک لەغەیری شوێنی خۆی دا ( وضع الشيئ في غیر موضعه ) .

# ئەنجام و بەرهەمی بڕوابەدوارۆژبوون

گوتراوە مرۆڤ چۆن بیربکاتەوە ئاواش دەژی ، بەڵێ لەڕاستی دا ئەوەی کە جۆرو چۆنیەتی هەڵس وکەوت و ژیان و گوزەرانی مرۆڤ دیاری دەکات ، ئەو تێڕوانین و بیرو باوەڕەیە کە لەدڵ و دەروونی دا پنجی داکوتاوەو دامەزراوە ، جا بێگومان ( بڕوابەدوارۆژ بوون ) یش یەکێکە لە سێ بنچینە هەرە گرنگ و مەزن و بنەڕەتی‌یەکانی بیروباوەڕی مرۆڤی مسوڵمان و ، دیارە بەئەندازەی گرنگی و مەزنیشی کاریگەری ی هەیە لە هەڵسووراندن و ئاراستەکردنی کاروبارو ڕەفتارو ئاکارەکانی دا .

جا ئێمە بەتەما نین کە لەم چەند لاپەڕەیەدا هەموو ئەنجام و بەرهەمە گرنگ و مەزنەکانی بڕوابەدوارۆژ بوون بخەینەڕوو ، بەڵکو وەک چەپکێک لە باغێک هەندێکیان لێ بەنموونە دەخەینەبەرچاوان :

## یەکەم / خۆ ئامادە سازکردن بۆ بەرد ارنگای خوا

یەکەمین ئەنجام و بەرهەمی بڕوابوون بە هاتنی

(دوارۆژ ) بریتیە لە خۆئامادەکردن بۆ لێپرسینەوەی بەر دادگای خودا ، چونکە تەنانەت ( قوتابی ) یەکی منداڵ و ساوا کە دەزانێ سەری مانگ یان سەری ساڵ نیزیک بۆتەوەو کاتی تاقیکردنەوەی هاتوە ، خۆی گورج دەکاتەوەو شەونخوونی دەکێشێ و بەیانیان زوو لەخەوێ هەڵدەستێ ، بۆئەوەی بتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە لەدەمی تاقیکرانەوەی دا ئاراستەی دەکرێن !

خوای بێ هاوتاش لەوەسفی کۆمەڵێک لە بەندە ڕاستەقینەکانی دا فەرموویەتی :( ویطعمون الطعام علی حبه مسکینا ویتیما وأسیرا . إنما نطعمکم لوجه الله لانرید منکم جزاء ولا شکورا . إنّا نخاف من ربنا یوما عبوسا قمطریرا ) الأنسان / ٨ - ١٠ . واته :

وە خواردنێک کە خۆشیان دەوێ - لەبەر برسیەتی و پێویستی پێ بوونیان - دەیدەن بە هەژارو هەتیوو دیل . - دەڵێن - ئێمە بەس لەبەر ڕەزامەندی خودا خواردنتان دەدەینێ ، هیچ جۆرە پاداشت و سوپاسێکمان لێتان ناوێ ، ئێمە لەلایەن پەروەردگارمانەوە لە ڕۆژێکی زۆر ڕووگرژو تاڵ دەترسین !

وەک دەبینین ئەو کۆمەڵە خواناسە لەسۆنگەی ئەوەوە کە ترسی دوارۆژیان هەیە کە ڕۆژێکی یەکجار سەخت و دژوارە ، تێرکردنی ئارەزووی خۆیان - لەگەڵ برسیەتییش دا - وەلادەنێن و پاروو لەزاری خۆیان دەگرنەوەو لەڕێ ی خوادا دەیبەخشن !

بەڵێ لەڕاستی دا گەورەترین ئەنجام و بەرهەمی

بڕوا بەخوا بوون و بڕوا بوون بەڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە بریتیە لە خۆگورج کردن و خۆئامادەکردن بۆ دیداری ئەو ڕۆژە ، پێغەمبەری ئازیزمان علیه الصلاة والسلام لەوبارەوە لە تەفسیری ( فمن یرد الله أن یهدیه یشرح صدره للأسلام .. ) دا فەرموویەتی :( إنّ النور إذا دخل في القلب انشرح له الصدر وانفسح ) . واتە :

بێگومان ڕووناکی - بڕوا - کە چۆ نێو دڵەوە ، سینە خۆی بۆ لێک دەکێشێتەوەو فراوان دەبێ ، ( قیل وهل لذلک علامة یا رسول الله ؟! ) گوترا : جا ئایا ئەو سینە فراوان بوون و دڵ ڕووناک بوونەوەیە هیچ نیشانەی هەن ئەی پێغەمبەری خودا ؟!

( قال نعم : التجافي عن دار الغرور ، والأنابة إلى دار الخلود ، والأستعداد للموت قبل نزوله ) أخرجه الحاکم .

فەرمووی بەڵێ : - یەکەم - خۆکێشانەوە لە مەنزڵگای فریوخواردن ، وە - دووەم - گەڕانەوە بەرەو مەنزڵگای هەمیشەیی ، وە - سێیەم - خۆئامادەکردن بۆ مردن بەر لە هاتنی .

ئنجا با بچینە خزمەت یەکی دیکە لە فەرموودەکانی پێغەمبەرو بەئەدەب و شەرمەوە گوێ ی دڵی بۆ بگرین داخوا سەبارەت بە مەسەلەی خۆسازکردن بۆ ڕۆژی دوایی چۆنمان ئامۆژگاری دەکات !

پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم لە فەرموودەیەکیدا فەرموویەتی :( لاتزول قدما عبد حتی یسأل عن أربع : عن عمره فیما أفناه ، وعن علمه ما فعل فیه ، وعن ماله مِنْ

أين اكتسبه وفيما أنفقه ، وعن جسمه فيما أبلاه ) .
رواه الترمذي . (١)

واته : دووپێی هیچ بەندەیەک لە ـ بەردادگای خوا ـ لاناچن هەتا لە چوار ـ شت ـ ان پرسیاری لێ نەکرێ :
لەتەمەنی ، داخوا لەچی دا بەڕێ ی کردوە ، وە لە زانیاریی داخوا چی پێ کردوە ، وە لە سامانیی داخوا لەکوێ ی وەدەست هێناوەو لەچی دا خەرجی کردوە ، وە لە جەستەی داخوا لەچی دا تولاندوویەتەوە !

کەواتە :

خۆئامادەکردن بۆ رۆژی دوایی بەوە دەبێ کە مرۆڤی مسولمان :
١ـ ئاگای لە چرکەو دەقیقەو سەعاتەکانی تەمەنی بێ بەخۆڕایی لەدەستی نەچن ، چونکە تەمەن دەستمایەی دەستی مرۆڤە !
٢ـ ئاگای لەو زانیاری و شارەزاییەی بێت کە خوا پێی بەخشیوە ، کە لەرۆژی دوایی دا زیانی لە قازانجی پتر نەبێ و ، لێی نەبێتە ملۆزم و رێ ی بەهانانی ببڕێ و ، لەسەری ببێتە شایەد !
٣ـ وە ئاگای لەو ماڵ و سامانەی بێ کە وەدەستی دێنێ و ، زۆرچاک بزانێ هەر درەمێک دوو پرسیاری لەسەر دەکرێن یەکیان لە چۆنیەتی پەیداکرانی ، ئەوی دیکە لە چۆنیەتی سەرفکرانی !

---

(١) بڕوانە ( کشف الخفا ومزیل الألباس .. ) للعجلوني ج٢ ص ٥١٢ .

٤- وه ئاگای له ئه‌ندامه‌كانی بێ و زۆرباش بزانێ سپارده ( أمانة ) ی خودان و پێی سپاردوون داخوا له‌چدا به‌كاریان دێنێ و چیان پێ ده‌كات !

ئێستاش ده‌چینه سه‌ر دووه‌مین ئه‌نجام و به‌رهه‌می بڕوابه‌دوا ڕۆژ بوون :

## دووه‌م / چاكردن و تۆندكردنی نه‌فس (١)

یه‌كی دیكه له ئه‌نجام و به‌رهه‌مه‌كانی بڕوابوون به‌ڕۆژی دوایی ، ئه‌وه‌یه كه مرۆڤ له‌سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه كه چاوه‌ڕێ ی لێپرسینه‌وه ( حیساب ) ده‌كات ، بێدار ده‌بێته‌وه‌و خۆی گورج ده‌كات و به‌خۆدا دێته‌وه ، نه‌وه‌ك له‌دوایی‌دا ڕووڕه‌ش و شه‌رمه‌زار بێ و ، چاوی له‌ئاقار خوادا هه‌ڵنه‌یه‌ن ، خوای زانا له‌وباره‌وه فه‌رموویه‌تی :( .. وأما مَنْ خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى فأن الجنة هي المأوى .. ) النازعات / ٤٠ ، ٤١ . واته :

---

(١) ئاڵقه‌ی دووه‌می زنجیره‌ی :( بووژاندنه‌وه‌ی ئیسلام ) كه بریتیه له ( ڕێگای صاڵح بوون و به‌ره‌وخوا چوون ) ته‌رخان كراوه بۆ توێژینه‌وه‌ی مه‌سه‌له‌ی خۆچاككردن و پاككردنه‌وه‌ی نه‌فس و صاڵح بوون و به‌ره‌وخوا چوون .

.. وە بەڵام کەسێک لە ڕاوەستانی پێش - دادگـــــای -
پەروەردگاری بترسێ و نەفسی لە ئارەزووەکان بگێڕێتەوە ،
ئەوە بێگومان بەهەشت مەنزڵگایەتی ..

وەک دەبینین ، خوای مەزن ( ترسانی لـــــەڕۆژی
لێپرسینەوە ) و ( نەفس گێڕانەوە لە ئارەزووان ) ی تێک
بەستوون و ، جڵەوگرتنی نەفسی کردۆتە ئەنجام و بەرهەمی
ترسان لە دواڕۆژ .

بەڵێ بەڕاستی هەست کردنی نەفس بەوەی کە ڕۆژێـــک دێ
هەق و حیسابی لەگەڵ بکرێ و بە چوونە بن گڵ هەموو شتێک
کۆتایی پێ نایەت و ( ڕۆژان ڕۆژیان لەدوان ) ، چاکتریـن
هۆیە بۆ سەرشکاندنەوەی و پرینگاندنەوەی لەو شتانـــەی
ئارەزوویان دەکات و لێی قەدەغە کراون ، هەربۆیـــــەش
پێغەمبەر صلى الله عليه وآله وسلم فەرموویەتی :( الدنیا
سجن المؤمن وجَنّةُ الكافر ) رواه مسلم والترمذي ومالِكٌ .
واتە : دنیا زیندانی بڕوادارەو بەهەشتی کافرە .

چونکە بابای بڕوادار وەک کەسێک کە لەنێو چوار دیواری
حەپسخانەیەکدا حەپس دەکرێ ، هەر لای ڕووی تێ دەکـــات ،
هەر پەرژین و دیوارو سنووری قەدەغەکراوەکانەو ، تـــا
ئەندازەیەکی زۆر ئازادی ی لێ دەگێڕێتەوەو ســـنووردار
دەکرێ ، بەڵام بابای بێ بڕوا وەک وڵاخێکی بەرەهەڵـــداو
بێ خاوەن ( ؟! ) بۆ هەر جێیەک بیەوێ و ئارەزوو بکاتو
نەفسی بخوازێ دەچێ ، بێ ئەوەی هیچ کۆسپ و لەمپـــەرو
تانەو چەپەرو پەرژینی بێنەبەرێ !!

کەواتە لەو ڕووەوە کە بابای گیراو ( مَسْجون ) ئازاد

نیەو ناتوانێ بەویستی خۆی ڕەفتار بکات و هەرچی پێی خۆش بوو بیکات و هەرچی ئارەزووی کرد بیخوات، کراوە بە وێچوێنراو ( مُشَبَّهٌ بِهِ ) ی مرۆڤی مسوڵمانی بەستراوە بە بەرنامەی خواوەو پابەند بە ڕێ و شوێنی پێغەمبەری پێشەواوە علیه الصلاة والسلام، وە لەو ڕووەوە کە باباى بەهەشتیی لە هەموو لایەنێکەوە ئازادەو هیچ شتێکی لێ قەدەغە نیەو، هەرچی کەیفی لێ بێ دەیکات و، چی ئارەزووی بکات دەیخوات، کراوەتە وێچوێنراوی بابای کافری بێ بەندو بارو بەرەڵداو هەست بە بەرپرسیاری نەکەر !!



## سێیەم / دنیابەکەمگرتن (الزهد)

یەکی دیکە لە ئەنجام و بەرهەمە گرنگەکانی بڕوا بەدوا ڕۆژ بوون بریتیە لە ژیانی دنیا نەکردنە ئامانج و مەبەست و بەکەمگرتنی، چونکە دنیا بەس پردی بەسەردا ڕەت بوون و، سێبەری لەژێردا حەسانەوەو پشوودان و، کێڵگەی تۆو تێدا وەشاندن و، ژووری تێدا تاقیکرانەوەیەو هیچی دی، وە ژیانی دنیا لەچاو ژیانی دواڕۆژ شتێکی یەکجار گچکەو نابووتە، خوای بێ وێنە لەوبارەوە فەرموویەتی :

( ... وإِنَّ الدار الآخره لَهِيَ الحَيَوان لوكانوا يعلمون ). العنكبوت / ٦٤ . واتە:

... وە مەنزڵگای دوارۆژ ژیانی ڕاستەقینەی تێدایە ئەگەر بزانن .

هەروەها فەرموویەتی :( .. فما متاع الحياة الدنيا في الآخرة إلاّ قليل ) التوبة / ٣٨ . واتە :
.. جا ڕابواردنی ژیانی دنیا لەچاو دوارۆژ بەس شتێکی کەمە .

پێغەمبەریش علیه الصلاة والسلام لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن ، بۆ وێنە :( الدنيا لاتعدل عند الله جناح بعوضة ). رواه الديلمي . واتە :
دنیا لەلای خوا باڵە مێشوولەیەک ناهێنێ .

وە فەرموویەتی :( ما الدنيا في الآخرة إلاّ مثل ما يجعل أحدكم أصبعه في اليمّ فلينظر بِمَ يرجع ؟! ) رواه مسلم .
واتە : دنیا لەچاو دوارۆژ بەس وەک ئەوە وایە کە یەکێکتان قامکی دەخاتە دەریاوە ، با بڕوانێ داخوا چی پێوە هاتوە؟!
( واتە ژیان و ڕابواردنی دنیا لەچاو دوارۆژ هەر وەک ئەو ئەندازە ئاوە وایە کە بە قامکی کەسێکەوە دێ کە دەیخاتە دەریاوە ، لەچاو ئاوی دەریا ) .

هەڵبەتە هەتا بڕوابەدوارۆژو پاداشتی نەبڕاوەی دوارۆژ ، لەدڵ و دەروونی ئینسان دا بەهێزتر بێ دیارە ئەندازەی قەناعەت و بەدنیاو ڕابواردنی دنیاوە ماندوونەبوون و ، دنیا بەکەمگرتن ( زهد ) زیاتر دەبێ .

وە بەپێچەوانەوە هەتا بڕوا بەڕۆژی دوایی کزتر بێ مرۆڤ بەتەماع ترو ئارەزووخوازترو بەدنیاوە ماندووتر دەبێ ، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەربارەی کەسانێک

که زیادەڕۆیی دەکەن لە ڕابواردنی دنیاداو دەیکەنـــــە ئامانج و مەبەستیان ، فەرموودەیەکی ترسناکی هەیە :

( إِنَّ مِنْ شرار أمتي الذين غُذُّوا بالنعيم يطلبون ألـــوان الطعام وألوان الثياب ويَتَشَدَّقون في الكـــــلام ) رواه الطبراني . واتە :

بەڕاستی لە خراپترین ئۆممەتم ئەوانەن کە بەنـــــازو نیعمەت پەروەردەکراون ، بەدوای خواردنی جۆراوجـــــۆرو جل و بەرگی ڕەنگاورەنگ دا وێڵن ، وە لەقسەکردنـــــیٚ دا فیزو دەمار دەنوێنن — و قسەی قەبەو قەڵەو دەکەن — .

بەڵام نابێ لەوە بێ ئاگابین ، کە دنیابەکەمگرتـــــن[1] ( زهد ) بەو ئیعتیبارە کە پردی بەسەردا ڕەت بـــــوون و جێی تاقیکرانەوەیەو شتێکی کەمە لەچاو بەهەشت ، لەگـــەڵ گرنگی دان بە ژیانی دنیادا ، بەو ئیعتیبارە کـــــە دەرفەتێکە خوای تێدا ڕازی دەکرێ و ، دەستمایەیەکـــــە بەهەشتی پێ وەدەست دێ ، دژی یەکدی نین .

---

(1) تا ئێستا وەک دیتوومە وشەی ( زهد ) بە دنیا نەویستـــی مانا کراوە ، بەڵام هەم لەڕووی زمانەوە هەڵەیە ، وە هـــەم لەڕووی ئیسلامەوە ، چونکە ( زهد ) لەئەسڵی زماندا بـــــە مانای بەکەمگرتن دێ ، دیسان ئیسلامیش ڕازی نیە کەس وازلە ژیانی دنیا بێنێ ، بەڵکو دەیەوێ مسوڵمان پیاوی هـــەردووک دنیایان بێ .

## چواره‌م / گرنگی دان به‌ ژیانی دنیا

وه‌ك له‌ خالّی پێشوودا گوتمان ژیانی دنیا نه‌كردنه‌ ئامانج و مه‌به‌ست و به‌كه‌مگرتنی له‌و ڕووه‌وه‌ كه‌ جێی تێدا تاقیكرانه‌وه‌یه‌ نه‌ك مانه‌وه‌ ، وه‌ له‌و ڕووه‌وه‌ كه‌ له‌چاو ژیانی به‌هه‌شت چاوتروكانێكه‌و هیچی دی ، له‌گه‌ڵ گرنگی دان به‌ژیانی دنیا له‌ڕوویێكی دیكه‌وه‌و به‌ ئیعتیبارێكی دیكه‌ تێك ناگیرێن ، وه‌ك ئه‌وه‌ی بڵێین :

ئه‌حمه‌د پزیشكه‌و ، مه‌حموود دارتاشه‌ ، ئه‌حمه‌د له‌ مه‌حموود شاره‌زاتره‌ له‌ پزیشكی دا ، وه‌ مه‌حموودیش له‌ ئه‌حمه‌د شاره‌زاتره‌ له‌ دارتاشی دا !!

وه‌ك ده‌بینین ( شاره‌زایی ) و ( نه‌شاره‌زایی ) له‌هه‌ركام له‌ ( ئه‌حمه‌د و مه‌حموود ) دا كۆبوونه‌وه‌ ، به‌ڵام له‌ دوو ڕووی لێك جوێ وه‌و ، به‌ دوو ئیعتیباری جودا .

وێنه‌یه‌كی دیكه‌ : ده‌ڵێین ئیسلام فه‌رمانمان پێ ده‌كات كه‌ له‌ئاقار خراپه‌دا چاكه‌ بكه‌ین ، وه‌ك قورئان فه‌رموویه‌تی ( إدفع بالتي هي أحسن ) ، وه‌ ئیسلام فه‌رمانمان پێ ده‌كات كه‌ له‌ئاقار مستێ دا درێشه‌ی ڕابگرین ، وه‌ك قورئان فه‌رموویه‌تی :( فَمَن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم ) ، دیاره‌ ئه‌م دوو قسانه‌ به‌ڕواڵه‌ت دژی یه‌كدین ، به‌ڵام كه‌ زانیمان فه‌رمانی یه‌كه‌م بۆ شێوه‌ی هه‌ڵس و كه‌وتی مسوڵمانانه‌ له‌نێو خۆیان داو ، ئی دووه‌م بۆ شێوه‌ی ڕه‌فتاریانه‌ له‌گه‌ڵ دوژمنان دا ، ده‌زانین كه‌ هیچ جۆره‌

دژایەتی‌یەک لەگۆڕێ دا نیە .

بەڵێ جایەکی دیکە لە ئەنجام و بەرهەمە مەزنەکانی بڕوابوون بەدوا ڕۆژ ، بریتیە لەوەی کە بابای مسوڵمان گرنگی و بایەخێکی زۆر بەژیانی دنیای و چرکەو دەقەو سەعاتەکانی دەدات ، چونکە وەک پێشتریش گوتمان ئەوەندە تەمەنە دیاری کراوەی کە بۆ هەر ئینسانێک دیاری کراوە ، سەرمایەو دەستمایەیەتی ، ئەگەر بازرگانی‌یەکی چاکی پێوە بکات ، دەتوانێ بەو تەمەنەی - جا کەم بێ یان زۆر - بەهەشتی بەرین و ڕازی کردنی خودا دابین بکات ، وە ئەگەر گوێ ی پێ نەدات و کەمتەرخەمی تێدا بکات دووچاری ماڵکاولی‌و چارە ڕەشی دەبێت ، خوای بێ پەڵە لەوبارەوە فەرموویەتی :

( وهم يصطرخون فيها ربنا أخرجنا نعمل صالحا غير الذي كنا نعمل ، أولم نعمركم ما يتذكر فيه مَنْ تذكر وجاءكم النذير فذوقوا فما للظالمين مِنْ نصير ) فاطر / ٣٧ .

واتە : وە ئەوان - کافرەکان - لەوێ دا هاوار دەکەن : پەروەردگارمان دەرمان بێنە ، کردەوەی چاک دەکەین نەک ئەوەی کە دەمان کرد - خوا پێیان دەفەرموێ : - ئەدی بە ئەندازەیەکی وا نەم ژیاندن کە هەرکەسێک ویستبای پەند وەربگرێ پەندی تێدا وەردەگرت؟! وە ئاگادارکەرەوەشتان بۆهات ، دە بیچێژن ! ستەمکاران هیچ یاریدەدەرێکیان نیە .

بەڵێ ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کە کێڵگەی دواڕۆژەو وەرزی تێدا چاندنە ،(١) پێویستە مسوڵمان زۆر زۆر بەگرنگ و

---

(١) تێروانینی ئیسلام سەبارەت بەژیانی دنیا لە یەکێک لە ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیەدا بەناوی ( ژیانی دنیا ) تویژراوەتەوە .

بایەخداری تەماشا بکات، بۆیە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی: ( لاتَسُبّوا الدنیا فنعم مطیة المؤمن ). رواه الدیلمي. (١)

واتە: جنێو بەدنیا مەدەن، چونکە چاکترین وڵاخی سواری – بەئامانج گەیەنەری – بڕوادارە.

بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کە تێیدا تاقی دەکرێتەوەو دەتوانێ بەهەشتی پێ وەدەست بێنێ، زۆر بەگرنگ تەماشای دەکات، بەڵام ئەوەی لەلای مسوڵمان شتێکی هەڵەو ناپەسندە ئەوەیە کە ژیانی دنیا بکرێتە لووتکەی هەرەبەرزی ئاوات و ئامانج و، بەسەر دواڕۆژدا هەڵبژێردرێ، هەڵبەتە ئەوەش خەسڵەتی کافرانە، وەک خودا فەرموویەتی: ( و ویل للکافرین من عذاب شدید. الذین یستحبون الحیاة الدنیا علی الآخرة .. ) إبراهیم / ٢،٣.

واتە: وە هاوار بۆ کافران لە ئازارێکی توند، ئەوانەی ژیانی دنیا بەسەر دواڕۆژدا هەڵدەبژێرن ..



---

(١) بڕوانە ( کشف الخفا ومزیل الألباس .. ) ج٢ ص ٤٧٨.

# پێنجەم/ خۆپاراستن لە ئازاردانی خەڵکی

بەرهەمێکی دیکەی بڕوابوون بەدوارۆژ ئەوەیە کە مرۆڤی مسوڵمان چاودێری ( مراقبة ) یەکی وردو چڕ داوێتەسەر دڵ و زمان و چاوو گوێ و دەست و لاقی و ، ئاگاداریان دەکات کە ( خەیاڵێک ، وشەیەک ، سیلە چاوێک ، گوێ هەڵخستنێک ، دەست وەشاندنێک ، هەنگاوێک ) یان (1) لێ نەپشکوێتەوە کە ئازارو زیانی مسوڵمانێکی تێدا بێ ، چونکە دەزانێ لە دادگای پڕ لە دادی خوادا هەموو شتێک چ گچکە بێ چ گەورە لێپرسینەوەی لەسەرەو ، لەم ژیانەدا هەموو وردو درشتی مرۆڤ لەچاکەو خراپە تۆمار دەکرێ و، بۆ ڕۆژی خۆی هەڵدەگیرێ ، وەک خودا فەرموویەتی :( و وضع الكتاب فترى المجرمين مشفقين مما فيه . يقولون يا ويلتنا ما لهذا الكتاب لايغادر صغيرة ولا كبيرة إلاّ أحصاها ووجدوا ما عملوا حاضرا ولايظلم ربك أحدا .. ) الكهف / ٤٩ .

واتە : وە لیستە ـ ی سەرژمێری تاوانان ـ ڕۆنرا ، جا تاوانباران دەبینی لەوەی کە تێیدایە ترسیان ڕێ نیشتووە ، دەڵێن : ئەی هاوار بۆ ئێمە ! ئەو لیستەیە چیە ـ تاوانی ـ

---

(1) لە کتێبی ( ڕێگای ساڵح بوون و بەرەوخوا چوون ) دا چۆنیەتی پاراستن لە خراپەو تاوان و بۆخوا بەکارهێنانی ئەندامە پەنهان و ڕوالەتیەکانی ئینسان ڕوون کراوەتەوە، بەتایبەتی لە قۆناغی چوارەم (پارێزکاری و وردبوونەوە ) دا .

گچكەو گەورەى نەبواردوە ، تێكراى سەرژمێر كــــردوە ، وە ئەوەى كردبوویان بەشامادەیی دیتیان ، وە پەروەردگــــارت ستەم لەكەس ناكات .

دیسان خواى دادگەر فەرموویەتی :
( ونضع الموازين القسط ليوم القيامة فلاتظلم نفس شيئــــا وإن كان مثقال حبة من خردل أتينا بها وكفى بنا حاسبين ) الأنبياء / ٤٧ . واته :
وە تەرازووە - راست و - دادگەرەكان لەرۆژى قیامەتیدا رۆدەنێین ، جا هیچ كەسێك ستەمی لێ ناكرێ ، وە ئەگــــەر - تاوانێك - سەنگی دەنكە خەرتەلەیەكی هەبێ دەیهێنیــــن ، وە ئێمە بەسین بۆ لێپرسینەوە .

هەڵبەتە ئەو تاوان و خراپانەش كە پەیوەندیــــــان بەخەڵكەوە هەیە كە لەزاراوى شەرع دا پێیان دەگوترێ : ( حق الناس ) ئەوە لەلاى زۆربەى زانایان تەنانەت بــــە تەوبەیەكی ساغ ( توبة نصوح ) یش لاناچن و هەتــــا رۆژى لێپرسینەوە هەر دەمێنن ، مەگەر ئەو كەسەى كە خراپەكــەى دەربارە كراوە باباى تاوانبار ببەخشێ و گەردنی ئــــازاد بكات .
ئنجا سەربارى سزاى دوارۆژ ،ئازاردانی خەڵكی دەبێتــــە هۆى هەڵوەشاندنەوەو لەنێوبردنی كردەوە چاكەكانیش ، بۆ ئەم مەبەستەش بەهێنانەوەى ئایەتێك و فەرموودەیــــــەك وازدێنین :
١- خواى بەبەزەیی و چاكەكار فەرموویەتی :( یا أیها الذیــن

آمنوا لاتبطلوا صدقاتكم بالمَنّ والأذى .. ) البقرة/٢٦٤ .
واته : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خێرەکانتان بەمنەت کردن و ئازاردان ـ ی دڵی بابای نەدار ـ بەتاڵ مەکەنەوە .

٢ـ پێغەمبەریش علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :
( أتدرون مَن المُفلس ؟! قالوا المفلس فينا مَن لا درهم لَهُ ولا متاع ، فقال إنّ المفلس مِن أمتي مَن يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام وزكاة ، ويأتي وقد شتم هذا ، وقذف هذا ، وأكل مال هذا ، وسفك دم هذا ، وضرب هذا ، فيعطى هذا مِن حسناته ، وهذا مِن حسناته ، فأن فنيت حسناته قبل أن يقضى ما عليه ، أخذ مِن خطاياهم فطرحت عليه ثم طرح في النار ) رواه مسلم .[1] واته :
دەزانن مایەپووچ[2] کێیە ؟! گوتیان : مایەپووچ لەنێو ئێمەدا کەسێکە نە پارەی هەیە نە ماڵ ، فەرمووی : مایەپووچ لە ئوممەتی من کەسێکە ڕۆژی قیامەتێ نوێژو ڕۆژوو و زەکات دێنێ ـ بۆبەر دادگا ـ بەوانەوە دێ بەڵام لەولاشەوە جنێوی بەم داوەو ، بوختانی بۆ ئەم هەڵبەستووەو ، ماڵی ئەمی خواردووەو ، خوێنی ئەوی ڕشتووەو ، لەمی داوە ، جا لە چاکەکانی دەدرێ بەمو ، دەدرێ بەو ، ئنجا کە چاکەکانی بڕان پێش ئەوەی قەرزەکانی بداتەوە ، لە تاوانەکانی وان ـ ئی خاوەن قەرزەکان ـ هەڵدەگیرێ و بەسەر وی دا دەدرێ ، دوایی فڕێ دەدرێتە نێو ئاگر ـ ی دۆزەخ ـ ەوە .

---

(١) بڕوانە ( ریاض الصالحین ) ص ١٠٤ .
(٢) مایەپووچ : قەلۆش ، هیچ پێ نەماو .

# شەشەم / بەرگداری وفیداکاری

ئەنجام و بەرهەمێکی دیکەی گرنگ و مەزنی بڕوابوون بەڕۆژی دوایی ، ئەوەیە کە باباى مسوڵمان لەسۆنگەی ئەوەوە کە دەزانێ ئەم ژیانە بەس پردی بەسەردا ڕەت بوون و، (١) تیسێی لەبن دا حەسانەوەیەو ، (٢) مەنزڵگای تێدا مانەوەو نیشتەجێ بوون ، بەس بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەو پیان و بەرینە ، دڵ بەم ژیانە دنیاییە نابەستێ و ، وەک شتێکی کاتی تەماشای دەکات ، جا بێگومان کەسێکیش ئاوا لەژیانی دنیاوە ڕامێنێ ، ترس و خۆحەشاردان و ڕاکردن لەمردن پەی بەفەرهەنگی مێشکی نابەن !.

چونکە لەڕاستیدا هۆی بنەڕەتیو سەرەکی ترس و ڕاچڵەکین و دڵ لەرزین ( لەمردن ترسان ،) ەو ئەمیش ئەنجام و بەرهەمی مسۆگەرو چاوەڕوان کراوی دنیاخۆشویستن و دڵ بەدنیاوە بەندبوونە ، وەک ڕابەرمان علیه الصلاة والسلام لەبەفەرموودەیەکی دا پەنجەی بۆڕاکێشاوە :

( کیف أنت یا ثوبان إذا تداعت علیکم الأمم ، کتداعیکم

---

(١) لەعیساوە سەلامی خوای لێ بێ گێڕراوەتەوە کە فەرموویەتی: ( الدنیا قنطرة فاعبروها ولاتعمروها ) .

(٢) پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :( .. ما أنا في الدنیا إلا کراکب استظل تحت شجرة ثم راح وترکها ) . رواه الترمذي . واتە :
من لەدنیادا ڕاست وەک سوارێک وام کە لەبن سێبەری درەختێک دا دەسرەوێ ، پاشان دەڕوا و بەجێی دێڵێ .

على قصعة الطعام تصيبون منه ؟ قال أَمِنْ قِلَّةٍ ؟ قال لا ، أنتم يومئذ كثير ، ولكن يُلقىٰ في قلوبكم الوهن ، قالوا وما الوهن يا رسول الله ؟! قال حبكم الدنيا وكراهيتكم القتال ) أخرجه البيهقي .(1)

واته : دەڵێی چی ئەی ( ثەوبان ) کە گەلان ـ ی کافر ـ داتان هاتنیو دەورەیان دان ، وەک چۆن ئێوە دەوری قاپە خواردنێک دەدەن و دایدێنێ ؟! گوتی ئایا لەبەر کەمیان ـ مان وامان لێ بەسەردێ ـ ؟! فەرمووی نەخێر ، ئێوە لەودەمیدا زۆر دەبن ، بەڵام بێ هێزی تان داویشترێتە نێو دڵی ، گوتیان جا ئەی پێغەمبەری خوا ( بێ هێزی ) چییە ؟ فەرمووی ئەوەیە کە دنیاتان خۆش دەوێ و کەیفتان بەجەنگ نایەت .

جا ئەوەی ڕاستی بێ بابایەک بڵێ بڕوام وایە کە ژیان بەس ئەم تاقە دەرفەتەی ژیانی دنیا نیەو ، ژیانی ڕاستەقینەو تێروتەواو لەدوا ڕۆژدایە ، ئەگەر ڕاست بکات بڕوای وابێ ، نابێ بەهیچ جۆرێک لە مردنێ بسڵەمێتەوە ، چونکە ئەو لەڕێ ی مردنەوە بەرەو ئەو مەنزڵگایە دەچێ کە ژیانی ڕاستەقینەی لێ یە !!

بەڵام دوو کەس جێی خۆیەتی لە مردنێ بترسن ، یەکەم : بابایەک کە پێی وایە ژیان بەس ئەم پێنج و دوو ڕۆژەی دنیایەو ، بە چوونە بن گڵ هەموو شتێک دەبڕێتەوەو دەبێتە

---

(1) بڕوانە ( منتخب كنز العمال ) ج1 ص189 / على حاشية مسند الإمام أحمد .

بەردی بن گۆمێ ، عارەب گوتەنی ( أرحام تدفع وقبور تبلع ) !
دووەم : کەسێک کە تێلەکەی گوناح و تاوانی ملی گیران
کردووە ، دڵنیایە کە بەڕووی ڕەش و سەری بەهەشەوە دەچێتە
بەردادگای خودا .
کەواتە :
ئەم ئەنجام و بەرهەمی شەشەمە – هەروەها زۆر لە
بەرهەمەکانی دیکەش – تایبەتە بەکەسێکەوە کە وێڕای بڕوا
هەبوونی بەڕۆژی دوایی ، خۆشی بۆ ئامادە کردبێ ، ڕاستتر
بڵێم : کە وێڕای دەعوای بڕوابەدوارۆژ بوون شایەدی
خۆبوئامادەکردنیشی پێ بێ !

## حەوتەم / کات بەخێرچوونی بەبەلاش

یەکی دیکە لەو میوەو بەرهەمانەی کە لە درەختی
( بڕوابەدوارۆژ بوون ) دەچنرێن بریتیە لەوەی کە بابای
بڕوادار دایم ودەرەم لەبیری خۆئامادەکردن و کۆکردنەوەی
ڕەفتارو کرداری چاک دا دەبێ ، گومانیشی تێدا نیە کە
بابایەکی وا هەموو چرکەو دەقەکانی تەمەنی بەکردەوەو
جموجۆڵی چاک و پەسندو خودایی یانە پڕدەکاتەوەو ، بۆشایی و
کەلێن و کونی تێدا نامێنن کە بەقسەی پووچ و گاڵتەو
جەفەنگ و ڕەفتاری ناڕێک پڕیان بکاتەوە .

خوای قسەلەجێو میهرەبانیش فەرموویەتی : ( قد أفلح المؤمنون . الذين هم في صلاتهم خاشعون . والذين هم عن اللغو معرضون .. ) المؤمنون / ١ - ٣ . واتە :
بەڕاستی ئەو بڕواداڕانە سەرفرازن کە لەنوێژەکەیان دا گەردن کەچ - و دڵ بێدار - ن و ، ئەوانەی کە لە پووچی خۆ لادەدەن ..

وەک دەبینین خوای زانا دووەمین خەسڵەت کە دەبێتە هۆی بەختەوەری و بەمرادگەیشتنی ئینسانی بڕوادار ، بە خۆپاراستن لەو شتانە دادەنێ کە پووچ و بێ کەڵکن .
( لغو ) ش وەک ( راغب الاصفهاني ) دەڵێ :( اللغو من الكلام مالا يعتد به وهو الذي يورد لا عن تروية وفكر فيجري مجرى اللّغا وهو صوت العصافير ونحوها من الطيور )(١)
واتە :
لەغوو لەقسان دا بەو جۆرە دەڵێن کە گوێ ی پێ نادرێ ، ئەویش ئەوەیە کە لەئەنجامی وردبوونەوەو بیرکردنەوەدا ناگوترێ و هەر پێ دا دەدرێ ، ئەوەش دەچێتە ڕیزی ( لغا ) وە کە بەدەنگی پاساری و ئەو باڵندانەی وەک وین دەگوترێ .

جا خوێنەری بەڕێز !
( لغو ) زۆر جۆرو چۆنیەتی هەن ، بەڵام ئەوە ئێمە

---

(١) بڕوانە ( مفردات ألفاظ القرآن ) ص ٤٥١ .

هەندێک لەو جۆرە ( لغو ) انە[1] کە لەنێومان دا بڵاو بوونەوە دەست نیشان دەکەین ، بەشکم بتوانین هەرچی زیاتر ساتەکانی تەمەنمان لە ( لغو ) پاک بکەینەوە ، بۆئەوەی یەکێک لە خەسڵەتە هەرە گرنگەکانی بڕواداڕانی سەرفرازو بەختەوەر لەخۆمان دا بێنینەدی :

<u>یەکەم</u> : هەر قسەیەک کە سوودی دنیاو دواڕۆژی تێدا نەبێ :

وەک گاڵتەو جەفەنگ و پێکەنینی زۆرو زۆر ڕۆین لەسەر باس و وەسفی خواردن و خواردنەوە .

<u>دووەم</u> : گێڕانەوەی زۆر بەسەرهات و ڕووداو کە خەڵک پێویستی پێیان نیەو هیچ سوودو پەندێکیان لێ وەرناگیرێ .

<u>سێیەم</u> : خوێندنەوەو گوێ ڕاگرتن لەو نامیلکەو کتێبانەی کە لە ئەفسانە ئاخنراون ، جا چ پەیوەندی یان بەناو - بەئیسلامەوە هەبێ ، چ نەبێ ، وەک : ( مەولوودنامە ) ، کە لە ئاڵقەی دووەمی ئەم زنجیرەیەدا لەبێزینگ دراوە ، ( میعراج نامە ) ، ئەوەی کە ( سەلام حەیدەری ) ناوێک ڕێکی خستوەو پڕە لە درۆو دەلەسە ، ( حیدرنامە ) ، ( فەتحی قەڵای خەیبەر ) ، ( غەزاوەتی

---

(1) شایانی باسە کە هەموو جۆرە ( لغو ) یەک لانی کەم ناپەسند ( مکروه ) ە و جاری وایە حەرامیش دەبێ ، بۆ وێنە : ئەگەر شتێکی فەرزی بۆ بچوێنێ .

بەدرو حونەین ) ، ( غەزاوەتی محمد حەنیفە ) ، ( إسماعیل نامە ) ، ( یوسف و زلێخا ) ، ( ڕۆستەم و زۆراب ) ، ( أمیر أرسلان ) ، ( مەنیجەو بیژەن ) ، ( ڕشتەی مرواری ) ... و زۆر کتێب و نامیلکەی دیکەی لەم بابەتانە .

چوارەم : ئەو گاڵتەو یاری یانەی کە لەشێوەی قومار دان ، جا چ لەسەر پارەو شت بکرێن ، کە ئەودەمــــــی حوکمەکەیان لە ( لغو ) پێبەڵاتر دەچێ و حەڕام[1] دەبن ، وە چ هەر بۆ کات بەڕێ کردن بێ ، وەک : دامــــە ، دۆمینە ، شەترەنج ، نۆرپیزکێنە ، سێ ڕیزکێنە ، کەلایەنە ، بن دەستە ، لگاو ، کەڵەمستێنە ... هتد .[2]

پێنجەم : گوێ ڕاگرتن بۆ زۆربەی ئیستگەکانی ڕادیۆی جیهانی ئەمڕۆ کە کەمتر وایە هەق و ڕاستیی بخەنەڕوو ،

---

(١) بەڵکو ( ابن حجر الهیتمي ) فەرموویەتی : زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە شەترەنج ئەگەر لەسەر ( شت ) یش نەکرێ ، هەر حەرامە ، هەروەها هەموو ئەو یاری یانەی کە لــــەو جۆرەن ، هەمان حوکمیان هەیە .
بڕوانە ( الزواجر عن اقتراف الکبائر ) ابن حجر الهیتمي . ج٢ ص ١٦٦ – ١٦٨ . هەروەها بڕوانە :( کفّ الرعاع عــــن محرمات اللهو والسماع ) ابن حجر الهیتمي / ص ١٥٢ – ٢٠٨ .

(٢) هەندێک لە زانایان بەپێی یاسای ( الأصل في الأشیـــاء الأباحة ) دەڵێن هەموو ئەو جۆرە یاری یانە بە سێ مەرجان ( مباح ) ن :
١- لەسەر شت نەکرێن . ٢- نوێژیان لەسەر دوا نەخرێ .
٣- لەدەمی یاری یەکەدا وشەی پیس و خراپ بەکارنەیەت .
بڕوانە ( الحلال والحرام في الأسلام ) ص ٢٩١ .
نووسینی : د . یوسف القرضاوي .

بەڵکو زۆربەیان بەپارە بۆ پڕوپاگەندە بەکرێ گیراون ، بەڵام بابی ئەوەندەی کە لە بارودۆخی دنیا تێ بگەین و بزانین چ باسە ، قەیدێ ناکات ، بگرە زۆر جاران هەر پێویستیشە ، چونکە ( عَرَفْتُ الشَرّ لا للشَرِّ لكن لِأتَّقيه .. ) .

شەشەم : تەماشاکردنی زۆربەی زۆری بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی وڵاتانی نائیسلامیو بەناو ئیسلامی ئەمڕۆ ، هەڵبەتە هەندێک بەرنامەی ( زانیاری ) بەسوودیان تێدا پێشان دەدرێن ، بەڵام قورئان گوتەنی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی ئەم سەردەمە ( إثمهما أكبر مِنْ نفعهما ) تاوانیان لە قازانجیان پترە .

بەڵام نابێ لەوەش بێ ئاگا بین کە گەلێک جاران تەماشا کردنی فیلمەکانی تەلەفزیۆن و گوێ گرتن لە زۆر جۆرە گۆرانی حوکمەکەیان لە کات بەفیڕۆدان ویۆوەتر دەچێ و دەبێتە شتێکی حەڕام ، چونکە ( كل مايجر إلى الحرام حرام ) .

حەوتەم : گوێ ڕاگرتن لەو گۆرانیو تەپڵ و تووزەڵەو چەقەنە لێدانەی کە کەسانێکی لۆتیو پۆتیو زمان شڕو پیس بەناوی هونەرەوە دڵ و مێشکی خەڵکیان پێ گلاو دەکەن ، بەڵام وەک گوتمان زۆر جاران ئەو شتانە لە ( لغو ) بەولاوەتر دەچن و دەچنە ڕیزی حەڕامیشەوە .

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کە هەندێک لاوک و حەیران و بەستەی کۆن و نوێ ی نەتەوەییو فۆلکلۆری هەن کە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان مادام ، وشەی پیس و بێ ئەدەبانەیان

تێدا نەبن و لەکات و شوێنی خۆیان داو ، بەئەندازەی پێویست بن حەڕام نین و ( موباح ) ن ، چونکە بنچینەیەکی شەرعی هەیە دەڵێت :

( الأصل في الأشياء الأباحة إلاّ مادل دليل على تحريمها ) .

واتە : هەموو شتێک لەئەسڵ دا حەڵاڵە مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر قەدەغەکرانی .

بۆ وێنە : گۆرانی کە بریتیە لە لاراندنەوەی دەنگ و ڕیزکردنی هەندێک وشەی کێش و سەروادار ( اللموزونة والمقفية ) ، نە لەبەر زاتی دەنگ لاراندنەوەکەو نە لەبەر عەینی ڕیزکردن و کێش و سەروای وشەکان حەڕام نابێ ، بەڵکو ئەوەی کە دەبێتە هۆی حەڕام بوونی ، بابەت و نێوەڕۆکی گۆرانییەکەو مەعناو مەبەستە خراپەکانیێتی ، وەک ئەو گۆرانییە بێ ئەدەب و بێ شەرمانەی کە ( حەسەن زیرەک ) و هەندێک شایەرو چاوەشی دیکە گوتوویانن ، کە لە فیلمێکی سینەمایی خراپتر وەسفی جەستەی ئافرەت دەکەن و هەر لە پرچو زوڵف و سەروگەردن و سینگ و سێدان و بەژن و بالایەوە هەتا بەری پێیانی دەیهێننە بەرچاوی خەیالی گوێ گر !!

بەڵێ ئەو جۆرە گۆرانیو هەڵبەست و شیعرو میعرانەی کە ئارەزووی ئینسان دەجوولێنن و بەرەو جلێتاوی خراپەو داوێن پیسی پەلکێشی دەکەن ، حەڕامن .

هەروەها هەر گۆرانیو هەڵبەستێکیش کە بەشێوەیەک بەخاک و ئاوو گەل و نیشتمان هەڵدەڵێ ، کە لەگەڵ بیرو باوەڕی ئیسلامیدا ناگونجێو دەیانکاتە بت و سەنەم لەباتی خوا !!

دیسان هەر جۆرە گۆرانیو هەڵبەستێک کە بە بیروباوەڕێکی

پووچی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوایی هەڵادەڵێ هەمان حوکمی پێشووی هەیە .

بەکورتی :

ئەو گۆرانیو لاوکو بەستەو حەیران و شیعرانە ئەگەر لە سنووری ئیسلام دەرنەچن و بۆ مەبەستێکی حەڵاڵ یان موباح بەکاربیێن ئەوە حەڵاڵن ، بەڵام بەپێچەوانەوە نا ، یان دەڵێین : هەرکام لەو شتانە ( حسنها حسن وقبيحها قبيح )(١)

---

(١) مەسەلەی حەڵاڵی یان حەرامیی گۆرانیو تەپڵ و دەهۆڵ و زورناو شمشاڵ و هەموو جۆرەکانی مۆسیقا ، یان بەحەڵاڵ دانانی هەندێک جۆریان و بەحەرام دانانی هەندێکیان ، لەنێو زانایان دا مشتومڕی زۆر لەسەرە ، بەڵام من ئەوەی گوتم بەشتێکی میانەڕەو ( وسط ) ی دەزانمو پێم وایە هەرکەسێکیش بەژیرانە سەرنجی تێکڕای ئەو دەقانە بدات کە لەوبارەوە گێڕراونەوە ، وە بەڕووحی ئیسلام و قورئان و سوننەت ئاشنا بێت ، هەر دەگاتە ئەو ئەنجامە کە من پێی گەیشتووم و ، غەیری ئەوە بە زیادەڕۆیی ( إفراط ) یان بەزایەدان ( تفريط ) دادەنێ .

( کێ ) ش . دەیەوێ لەوبارەوە زیاتر شارەزا بێت و ، ئاگاداری بیروڕای زانایان بێت ، دەتوانێ سەرنجی ئەم سەرچاوانە بدات :

١- ( كف الرعاع عن محرمات اللهو والسماع ) نووسراوی : ابن حجر الهيتمي .
٢- ( الحلال والحرام في الإسلام ) نووسراوی : د. يوسف القرضاوي .
٣- ( الحلال والحرام في الإسلام ) نووسراوی : الشيخ أحمد محمد عساف .
٤- ( الزواجر عن إقتراف الكبائر ) نووسراوی : ابن حجر الهيتمي ..

**هەشتەم** : کەوبازی ی و کۆتربازی ی و [1] هتد :

یەکی دیکە لەو ڕەفتارە پووچانەی کە جگە لەکات کوشتن و تەمەن بەزایەدان هیچی دیکەیان لێ هەڵناوەرێ ، سەرگەرم بوونە بە ڕاگرتن و خزمەتکردنی چەند جۆرە باڵندەیەکەوە ، کە ڕاگرتن و دیل کردنیان هیچ جۆرە سوودێکی ماددی و مەعنەوی نیە ، وەک ( کەو ) و ( کۆتر ) و ( بولبول ) و .. هتد .

ئنجا کاتی وا هەیە ڕاگرتنی ئەو جۆرە باڵندانە حوکمەکەی لە ( لغو ) ش بەولاوەتر دەچێ و ، دەچێتە ڕیزی حەڕامەوە ، بۆ وێنە :

١- هەرکاتێک ئەرک و پێویستییەکی لەسەر بچوێنی ، وەک : نوێژ ، لەئاییین شارەزابوون ، یارمەتی دانی لێقەوماوێک ، جێبەجێ کردنی فەرمانی دایک و باب ، جیهاد ...

٢- ئەگەر شەڕیان پێ بکەن ، وەک ( شەڕە کەو ) یان ( شەڕە کەڵەشێر ) .

٣- ئەگەر بەنرخێکی زۆر بکڕرێن و ماڵ و خێزانیشی ، یان خزمی ، یان دراوسێی ، یان برادەرێکی ، یان مسوڵمانێک کە لەحاڵ و باڵی ئاگادارە ، نەدار بێ .

**نۆیەم** : ڕاگرتنی سەگ و تاژی بەبێ هۆ :

پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لەوبارەوە فەرموویەتی:

---

(١) بڕوانە ( کفّ الرعاع عن محرمات اللهو والسماع ) ص ٢٠٥-٢٠٨ .

( مَنْ اقتنى كلبا ليس بكلب صيد ولا ماشية ولا أرض ، فأُنه ينقص مِنْ أجره قيراطان كل يوم ) . رواه مسلم .

واته : هەرکەسێک سەگێک ـ تاژی : بەعارەبی ( کلب صید ) سەگی ڕاوی پێ دەگوترێ ـ ڕابگرێ ، کە نە سەگی ڕاوێ بێ نەشی مەڕومالات نەئی پاسەوانی کشت وکال ، ئەوە بێگومان هەموو ڕۆژێ دوو قیراط لە پاداشتەکەی کەم دەکرێتەوە . (١)

هەڵبەتە ڕاگرتنی سەگ و تاژی و تولەو هەر گیانداریکی دیکەی وەک وانیش ئەگەر لەو سێ حاڵەتانەدا نەبێ کە باسکران ، (٢) هەرتا ئەوکاتە بە ( لغو ) دادەنرێ ، کە نە ئەرک و پێویستی لەسەر بچوێنرێ ، نە بۆ شەڕپێکردنێ بێ (٣) نە زیادەڕۆیی لە نرخەکەیان دا هەبێ ، ئەگەرنا حەرام دەبێ .

دەیەم : گەڕان و پیاسەکردن بەبازاڕو بەو شوێنە گشتییانەدا کە جێی هاموشۆی ئافرەتانن ، بەبێ شیش وکاریکی گرنگ و پێویست .

ئنجا بێگومان هەر عەینی گەڕان و سووڕان و پیاسەکردنەکە ـ ئەویش بەمەرجێک ئەرک و فەرمانێ لەسەر نەچوێنێ ـ

---

(١) مەبەست لە قیراط کە ( مختار الصحاح ) بە ( نصف دانق ) نیو دانگ لێکی داوەتەوە ، ئەندازەیەکی دیاری نەکراوی مەعنەوی یە ، واتە هەرکەسێک ئەو کارە بکات ئەوە دوو ئەندازە لە پاداشتی کردەوە چاکەکانی کەم دەکرێتەوە .

(٢) بە ( قیاس ) یکی ( طریق الأولی ) لەسەر ئەو سێ حاڵەتە ، دەتوانین بڵێین بابای دوژمنداریش بۆی هەیە سەگ و تاژی و تولە ڕابگرێ ، چونکە پاراستنی نەفس لە پاراستنی ( ماڵ ) لەپێشترە ، جا مادام بۆ پارێزگاری ماڵ دروست بێ ، دیارە حەوجار حەوجار بۆ پارێزگاری نەفسیش دروستە .

(٣) بڕوانە ( کفّ الرعاع عن محرمات اللهو والسماع ) ص ٢٠٨ .

بە ( لغو ) دادەنرێ ، دەنا ڕوانین و سەرنج دانی ئافرەتان ئەوە شتێکی حەرامە ، وەک خۆشەویست فەرموویەتی :
( العینان زناهما النظر .. ) متفق علیه . واتە :
زینای چاوان ڕوانینی حەرامە .

یازدەیەم : زیادەڕۆیی لەچەند جۆرە یاری یەک دا :

چەند جۆرە یاری یەک هەن کە لەئەسڵ دا حەلاڵ و چاکن ، چونکە دەبنە هۆی بەهێزکردنی جەستەو ئەندامەکانی ، دیارە بەهێزکردنی جەستەو ئەندامەکانیشی یەکێکە لە ئەرکەکانی مرۆڤی مسوڵمان ، چونکە خودا فەرموویەتی :( وأعدوا لهم ما استطعتم مِنْ قوة ... ) . الأنفال / ٦ .

ڕابەریشمان علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :( والمؤمن القوي خیر وأحب إلی الله مِنَ المؤمن الضعیف )رواه مسلم .
واتە : وە بڕواداری بەهێز چاکترەو لەلای خوا خۆشەویستترە ، لە بڕواداری بێ هێز .

بەڵام ئەو جۆرە یاری یانە بەهۆی زیادەڕۆیی تێداکردنەوە دەبنە کارێکی ( لغو ) ، وە ئەگەر ببێت و زیادەڕۆیی یەکە بەئەندازەیەک بێت کە بابای یاریکەر ئەرک و پێویستی یەکانی فەرامۆش بکات و لەبەر سەرگەرم بوونی بەیاری یەکەیەوە نەیپەرژێتە سەر بەڕێوەبردنی کاروباری ئیسلامی ، یان یاری یەکەی بەشێوەیەک بکات کە لەقالب و شیرازەی ئیسلام بچێتەدەرێ ، وەک دەبەرکردنی بەرگی کورت و تەسکی ئەوتۆ

که عەورەتی وەدەربخات ، یان وەسفی بکات ، وە وەک تێکەڵ بوونی نێرو مێ و .. هتد ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا ئەو جۆرە یاری یانە حوکمەکەیان لە ( لغو ) بوون پێهەڵاتر دەچێو دەچێتە ڕیزی حەڕامەوە .

ئەو یاری یانەش وەک :

سوارچاکی ی ، نیشانەداکردن ، تۆپ تۆپێن ، زۆرانبازیی، شەڕە مست ، ڕاکردن ، بازبازێن ، مەلەوانی .. هتد .(١)

## دوازدەیەم : جگەرەکێشان :

جگەرەکێشان کە پیس ترین و باوترین خووی پووچی

---

(١) پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی : ( کل شئ لیس من ذکر الله فهو لغو أو سهوا ، إلاّ أربع خصال: مشي الرجل بین الغرضین ، وتأدیبه فرسه ، وملاعبته أهله ، وتعلیمه السباحة ) رواه الطبراني بأسناد جید .
واتە : هەرشتێک کە پەیوەندی بە یادی خواوە نەبێت ، ئەوە پووچە یان بێ ئاگایی یە ، جگە لە چوار شت : ١ـ هاتوچۆ کردنی ئینسان لەنێوان دوو نیشانان ـ کە بۆ تیرەندازی داکراون ـ ٢ـ وە ڕاهێنانی ئەسپەکەی ، ٣ـ وە یاری و دەستبازی کردنی لەگەڵ خێزانەکەی ، ٤ـ وە فێرکردنی مەلەوانی .

تێبینی :

بێگومان هەر جۆرە یاری یەکی دیکەش کە لەو جۆرانە بێت هەمان حوکمی هەیە ، ئنجا سەرباری ئەمەش بەهێزکردن و ساغ ڕاگرتنی لەش ـ کە جوولان و یاری کردن دەورێکی گرنگی تێدا دەگێڕێ ـ خۆی لەخۆی دا شتێکی چاک و پێویستیشە ، چونکە خوا فەرمانی پێ کردووین کە هەرچی لەتوانامان دا هەیە لە هێز ( قوة ) بۆ دوژمنانی ئامادە بکەین ، دەجا گومانی تێدا نیە کە هێزی جەستەش یەکێکە لەو جۆرە هێزانەی کە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنان دا پێویستی مان پێ یەتی .

ئەم سەردەمەیەو خەڵکێکی زۆر پێیەوە گیرۆدە بووە ، لەنێو زانایان دوو ڕای دەربارە خراونەڕوو ، هەندێکیان بەحەڕامی دەزانن و هەندێکیشیان بەس بە ناپەسند ( مکـــــروه ) ی دەزانن ، هەڵبەتە ئێمە ئەو ڕایە بەڕاست دەزانین کـــە جگەرەکێشان بەحەڕام دادەنێو ، پێمان وایە باباى جگەرەکێش کەم و زۆر گوناحبار دەبێت .

جا ئێمە بەڵگەمان زۆرن لەسەر حەڕامیی جگەرە ، بـــەڵام لێرەدا مەوداى خستنەڕووی هەموو انیمانمان نیەو بەکورتـــی سەرەکییەکانیان دەخەینەڕوو :

١- بێگومان جگەرە شتێکی پیس و زیانبەخشەو ، هەموو شتێکـــی پیس و زیانبەخشیش حەڕامە ، کەواتە جگەرەکێشان حەڕامە .

لێرەدا ئەنجام ( نتیجة ) یێکمان هەیە کە لە دوو پێشەکی ( مقدمة ) یان پەیدا بووە ، کەواتە هەرکاتێک ڕاستی ی و تەواوی ی دوو پێشەکییەکان سەلمێنرا ، ڕاستیی و تەواوی ی ئەنجامەکەش کە بریتیە لە ( حەڕامیی جگەرەکێشـــــان ) دەسەلمێنرێ .

پێشەکی یەکەم :

( جگەرە پیس و زیانبەخشە ) ئەمە ڕاستییەکە واقیعـــی ژیانی جگەرەکێشەکان و هەموو پزیشکەکان شایەدی ی لەسەر دەدەن ، هەڵبەتە ئەگەر گریمان بابایەکی جگەرەکێشیـــــش بڵێ نەخێر جگەرە پیس و زیانبەخش نیە چونکە من جگـــەرەش دەکێشم و زیانیشی پێ نەگەیاندووم ، ئەوە قسەکەی جـــێ ی ئیعتیبار نیە چونکە :

١- بۆ پرسیارکردن دەربارەی واقیع و چۆنیەتی هەرشتێک دەبـێ لەوانە پرسیار بکرێ کە لەو شتەدا کارامەو شـــارەزان ،

واته ( أهل الأختصاص ) ن ، دیاره پزیشکەکانیش لەو بوارەدا پسپۆڕی یان هەیەو شارەزاترن .

٢- هیچ بنچینە ( قاعدة ) یەک بە ڕێزپەڕ ( شاذ ) هەڵناوەشێتەوە ، وە لەهەموو شتێکدا ئیعتیبار بە زۆربە ( أغلبية ) دەکرێ .

٣- ئەگەر بێت و هەرکەسێک شتێکی حەرامکراوو زیانبەخشی پێ خۆش بوو و حاڵ و وەزعی تایبەتی ( ڕاست ) یان ( درۆ ) ی خۆی بە بەڵگە هێنایەوە ، ئەوە هیچ شتێکمان لەدنیادا بۆ قەدەغە ناکرێ ، چونکە : هەیە دەڵێ ( گۆشتبەراز ) زیانم لێ نادات ، وە هەیە دەڵێ بە ( مەیخواردنەوە ) قەڵەو دەبم ، وە هەیە دەڵێ بە ( قومار کردنێ ) بەختیار دەبم و .. هتد .

ئنجا با بچینە سەر پێشەکی دووەم :

( هەموو شتێکی پیس و زیانبەخش حەرامە ) .

ئەمەش دیسان ڕاستییەکە کە هیچ کەس توانای نکوولی و لاموجیمی لەبەرانبەری دا نیە ، چونکە خودا بەدەقی قورئان فەرموویەتی :( .. يحل لهم الطيبات ويحرم عليهم الخبائث ..) الأعراف / ١٥٧ . واتە :

- پێغەمبەری نەخوێندەوار عليه الصلاة والسلام-(طيبات )یان بۆ حەڵاڵ دەکات و ( خبائث ) یان لێ حەرام دەکات ..

جا ئێستا با سەرنج لە دوو وشەی ( طيبات ) و ( خبائث) بدەین داخوا چ دەگەیەنن :

( راغب الاصفهاني ) دەربارەی وشەی ( طيب ) گوتوویەتی :

( وأصل الطيب ما تستلذه الحواس وما تستلذه النفس )[1] .

---

(١) بڕوانە ( مفردات ألفاظ القرآن ) ص ٣٠٨ .

واتە : وە وشەی ( طیب ) لەبنچینەدا بەشتێک دەگوترێ کە هەستەکان پێیان خۆشەو نەفس چێژی لێ وەردەگرێ .

هەروەها دەربارەی ( خبائث ) گوتوویەتی :( والخبیث مایُکْرَه رَداءةً وخساسةً محسوساً کان أو معقولاً ) .(١)

واتە : وە ( خبیث ) ئەوەیە کە بەناپەسند دادەنرێ لەبەر خراپیو نابووتییانی ، چ بەرهەست بێ چ مەعنەوی .

وە دەربارەی ( ویحرم علیهم الخبائث ) گوتوویەتی : ( أي مالا یوافق النفس من المحظورات ) .(٢) واتە : ئەوەی کە لەگەڵ سروشت دا ناگونجێ لە قەدەغەکراوەکان .

کەواتە : ( طیبات ) ئەو شتانەن کە لەگەڵ میزاجو سروشتو جەستەی ئینسان دا دەگونجێن و مرۆڤ سوودیان لێ وەردەگرێ .

وە ( خبائث ) ئەو شتانەن کە بەپێچەوانەوە لەگەڵ سروشتو جەستەی مرۆڤ دا ناگونجێن و بە خواردنیان زیانبار دەبێت .

ئنجا پێشتریش سەلمێنرا کە ( جگەرەکێشان ) لە ( خبائث ) ەو ئێستاش ڕوون بۆوە کە هەرچی ( خبائث ) بێ وشەی ( تحریم ) ی بەسەردا دێ ، کەواتە :

جگەرەکێشان حەڕامە چونکە پیسو زیانبەخشەو ، هەموو پیسو زیانبەخشێکیش حەڕامە .

ئنجا ئەگەر یەکێکیش بڵێ : مادام ( طیبات ) هەرشتێک بێ نەفس حەزی لێ بکات ، کەواتە ( جگەرەکێشان لە ( طیبات )ە ، چونکە نەفسی من حەزی لێ دەکات !!

---

(١) بڕوانە ( مفردات ألفاظ القرآن ) ص ١٤٠ .

(٢) هەمان سەرچاوە [illegible]

لەوەڵامدا دەڵێین :

هەرچەندە پێشتر بەرپەرچی ئەو جۆرە قسانە درایەوە بەڵام بۆ پتر ڕوونکردنەوە دەڵێین :

دیارە هەموو نەفسێک سەنگی مەحەک نییە ، دەنا هەموو ئەوانەش کە مەی دەخۆنەوەو گۆشتی بەراز دەخۆن و کاری پیس و گڵاو دەکەن ، دیارە نەفسیان حەز لەو جۆرە شتانە دەکات !!

بەڵکو لێرەدا ئیعتیبار بە سروشت و میزاجێکی ساغ و تەواو دەکرێ ، ئنجا بێگومان هەموو ئەوانەش کە بە دووکەڵ و خڵتەو ژەنگی جگەرە سروشتیان پیس نەبووەو میزاجیان تێک نەچووە ، بە بۆخڵتەو بە دووکەڵی جگەرە سەریان گێژ دەبێ و دڵیان تێکەڵ دێ و بێزار دەبن .

ئنجا لەبەر کەم دەرفەتی چەند بەڵگەیەکی دیکەش دێنینەوە ، بەڵام زۆر بەکورتی و گوشراوی :

٢- زیادەڕۆیی و ماڵ بەزایەدان بەبەڵگەی قورئان و سوننەت حەرامە ، دیارە ئەو پارەیەش کە بە جگەرە دەدرێ نەک جارێک دوو جاران بەزایە دەدرێ ، یەکەم کە لەقیس دەچێ بەبێ بەرهەم ، دووەم کە مرۆڤ دووچاری چەندان نەخۆشی پیسیش دەکات ، وەک ( شێرپەنجە - سرطان - ) و ( نەخۆشی دڵ ) و ( نەخۆشی سی یەکان ) و ( نەخۆشی دەمارەکانی خوێن هێنان و بردن ) و ( نەخۆشی قوڕگ و گەروو )و .. هتد .

خوای زانا دەربارەی ماڵ بەفیڕۆ خەرجکردن فەرموویەتی:
( ولاتبذر تبذيرا ، إنَّ المبذرين كانوا إخوان الشياطين.. )
الأسراء / ٢٦ ، ٢٧ .

له پێغه‌مبه‌ریش علیه الصلاة والسلام گێڕراوه‌ته‌وه که :
( إنه كان ينهي عن قيل وقال وإضاعة المال .. ) متفق عليه .
پێغه‌مبه‌ری خوا ڕێگری کردوه له قسه‌گێڕانه‌وه‌و قسه‌هێنان و بردن ، وه له به‌زایه‌دانی ماڵ ..

٣- بێگومان خۆکوشتن حه‌ڕامه وه‌ک خودا فه‌رموویه‌تی :
( ولاتقتلوا أنفسكم .. ) النساء / ٢٩ .
ئنجا وه‌ک ڕوونیشمان کرده‌وه جگه‌ره‌کێشان سه‌رچاوه‌ی زۆر جۆره نه‌خوشی وایه که مه‌رگی ئینسانیان له‌گره‌ودایه ، دیتوومانه‌و بیستووشمانه که زۆر که‌سی پێ مردوه ، که‌وابێ جگه‌ره‌کێشان جۆرێکه له خۆکوشتنێکی سست و پله‌پله‌یی .
پێغه‌مبه‌ریش علیه الصلاة والسلام هه‌موو شتێکی سه‌رخۆشکه‌رو بێ هێزکه‌ری قه‌ده‌غه‌کردوه به‌ده‌قی فه‌رمووده‌ی :
( نهى عن كل مُسْكِرٍ ومُفَتِّرٍ ) رواه أحمد وأبوداوود عن أم سلمة وقال السيوطي صحيح . واته :
ڕێگری کردوه له هه‌موو شتێکی سه‌رخۆشکه‌رو بێ هێزکه‌ر .

بڕوانه ڕابه‌رمان چۆن مه‌یخواردنه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ خواردنی هه‌رشتێکی بێ هێزکه‌رو له‌ش سست که‌ردا باس کردوه ! [1]

٤- دیسان زه‌ڕ به‌خه‌ڵکی گه‌یاندن حه‌ڕامه وه‌ک ڕابه‌رمان فه‌رموویه‌تی : ( لاضرر ولا ضرار ) رواه مالك و أحمد .
ده‌جا جگه‌ره‌کێشان له‌نێو ترومبێل و له‌به‌رو مه‌جلیسدا

---

(١) بڕوانه ( فيض القدير ) ج٦ ص ٣٣٨ .

لە دوو سەرەوە زیان بەخەڵکی دەگەیەنێ :

یەکەم : کە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکێک ئەو دووکەڵ و ژەهرە پیسە هەڵمژێ کە بەهۆی جگەرەکێشانی وی یەوە پەیدا بووە .

دووەم : کە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکێک بەتایبەتی منداڵ و هەرزەکارەکان لاسای بکەنەوەو فێری ئەو خووە بەدە بن ، بەتایبەتی ئەگەر پلەوپایەیەکیشی هەبێ لە کۆمەڵ دا ، بۆ وێنە ( مامۆستا ) یەک بێ !!

٥- ئنجا بێگومان دەستمایەی دەستی هەر ئینسانێک ئەو چرکەو تاوانەن کە تەمەنی پێک دێنن ، بەڵام باباى جگەرەکێش هەموو ڕۆژی ئەندازەیەکی زۆر لە تەمەنی خۆی بە ئاگری جگەرە دەسووتێنێ و بەدەم دووکەڵ بەباکردنەوە بەبای دەدات !!

ئنجا لەکۆتایی دا دەڵێم :

ئەگەر وڵاتێکی (١٥) ملیۆن کەسی لەبەرچاو بگرین و لانی کەم (٤) ملیۆنی جگەرەکێش بێ ، دەزانی ساڵێ چەندەیان پارەو ماڵ لەدەست دەچێ ؟!

(٤) ملیۆن کەس یەکی لانی کەم ڕۆژێ نیو دینار ریان دەوێ ، کەواتە :

۰۰ / ۰۰۰ /۴ × $\frac{۱}{۲}$ = ۰۰۰ / ۰۰۰ / ۲ دینار لە هەر ڕۆژێک دا ، ئەدی ساڵێ دەکاتە چەند ؟!

۳۶۵ × ۰۰ / ۰۰۰ / ۲ = ۰۰۰ / ۰۰۰ / ۷۳۰ دینار لەماوەی ساڵێک دا دەسووتێ و دەبێتە دووکەڵ !!

---

ئنجا وانەزانی هەر بەوەندە ( مەسرەف ) ە قوتار دەبێ!

چونکە پاشان ئەو جگەرەکێشانە نەخۆشیان دەکات و ، ڕەنگە حەوسەدو سی ملیۆنی دیکەشیان پتر تێ بچێ بۆ چارەسەر لە داوو دەرمان و جێگەو ڕێگەو مووچەی دوکتۆرو .. هتد .

لەگەڵ ئەوەش دا کە هەموو ئەوانەی بە زەهری جگەرە نەخۆش بوو ون چاکیش نابنەوەو هەندێکیان دەشمرن !!

کەواتە :

چۆن دەبێ جگەرەکێشانێکی وا شووم و بەد حەرام نەبێ ؟!!



سێزدەیەم : خۆڕازاندنەوەو بەخۆداهاتنی زیاد لەپێویست :

ڕەوشتێکی ئیسلامیی پەسندە کە هەم ژن و هەم مێردیش خۆیان بۆیەکدی جوان بکەن ، بۆ نموونە دایکی بڕواداران(عائشة ) خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی :( أميطي عنكِ الأذى ما استطعتِ ) أخرجه الطبراني .

مەبەستی ئەوەیە کە ئافرەتی مسوڵمان چەندی پێی دەکرێ با خۆی بۆ مێردەکەی برازێنێتەوەو ئەو شتانەی دەبنە هۆی ناشیرین کردنی لەخۆیان دوور بخاتەوە .

( إبن عباس ) یش (1) خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی :

---

(1) ( إنّي لأتزين لِأمرأتي كما تتزين لي ) بڕوانە ( الحلال والحرام في الاسلام ) ص ١٤٥ / الشيخ أحمد محمد عساف .

( من خۆم بۆ هاوسەرم ڕێک وپێک دەکەم هەروەک چۆن ئەو خۆی بۆ من دەڕازێنێتەوە ) ..

بەڵام بەدەردی پێشینان گوتوویانە :( هەموو شتێک بەخوێ " خوێ " ش بەمەعنا ) !

زیادەڕۆیی و تێپەڕاندن لەهیچ شتێک دا پەسند نیە .

جا بێگومان یەکی دیکە لەو ڕەفتارانەی کە بە ( لغو ) دادەنرێن ، ئەوەیە کە زۆر لە ئافرەتان ڕۆژ بەدرێژایی ڕۆژێ لەبەر ئاوێنەن و هەموو ئیش و کارێکیان بۆتە خۆڕازاندنەوەو خۆ تاس ولووس دان !

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە نابێ لێی بێ هەواڵ بین :

بەس لەحاڵێک دا زیادەڕۆیی کردنی ئافرەت لە خۆڕازاندنەوەو بەخۆداهاتن دا بەتاریکی چاک یان موباح یان پووچ دادەنرێ کە ئەم مەرجانەی خوارێ ی تێدابن :

یەکەم : بەس بۆ مێردو حەڵاڵی خۆی یان بۆنێو ئافرەتان و دەستە خوشکەکانی وابکات .

دووەم : ئەم ڕەفتارەی نەبێتە هۆی فەوتانی ئەرکێکی پێویستی سەرشانی ، لە نوێژو خواپەرستی و کاروباری ماڵ و مێردو پەروەردەکردنی منداڵەکانی و .. هتد .

سێیەم : ئەوەندە پارە مەسرەف نەکات کە باری شانی مێردەکەی یان کەس و کاری - ئەگەر کچ بێ - قورس بکات و ، بۆی دەرنەچێ !

کەواتە :

خۆڕازاندنەوەی ئافرەت - چ ژن بێ چ کچ - لەچەند حاڵەتێک دا حەرام دەبێ ، بۆوێنە :

١ـ ئەگەر ئەو خۆڕازاندنەوەیەی بۆ ئەوەبێ سەرنجی خەڵکی بەلای خۆی دا ڕابکێشێ ، واتە ، بیەوێ بە نیگای نزم و بێ شەرمانەی دڵ و هەناوی پیاوان بپێکێ و بە کەمەندی زوڵف و ئەگریجەی جادووگەرانەی بیانگرێ و نێچیریان بکات و ... هتد .

ڕابەری داناشمان علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :
( أیما إمرأة استعطرت فمرت علی قوم لیجدوا مِنْ ریحها فهي زانیة ) رواه النسائي . واتە :
هەر ئافرەتێک خۆی بۆنخۆش بکات ـ کە جۆرێکە لە خۆڕازاندنەوە ـ وە بەلای کۆمەڵێک دا ڕەت بێ تاکو بۆنی بکەن ئەوە داوێن پیسی کردوە . ( مەبەست لە داوێن پیسی ـ یەکەی ئەوەیە کە سەرنجی خەڵکی بەلای خۆدا کێشان ، پێشەکی و ڕێ خۆشکردنە بۆ زینا ، دیسان ئەو پیاوانەش لووتیان بەهۆی هەڵمژینی ئەو بۆنەوە تووشی جۆرە زینایەک دەبێت ، دیارە ئەو ئافرەتەش لە تاوانی وانیش دا هاوبەشە ) .
٢ـ ئەگەر خۆڕازاندنەوەکەی هێندەی تێ بچێ کە مێردەکەی، یان کەس و کاری سەنگیان بکەوێتە سەر .
٣ـ ئەگەر خۆڕازاندنەوەکەی لەلای پیاوێکی بێگانەو نامەحرەم بێت ، کە ئەودەمی حەرامییەکەی زۆر بێرەزا دەبێ و ڕەنگە چی وا لەبەر زینا بەدا نەبێ ، هەڵبەتە زۆریش نیزیکە ئەو جۆرە ئافرەتانەی لەلای پیاوی بێگانە خۆ جوان دەکەن بەجۆرێک لە جۆرەکانی خۆدۆڕاندن ، خۆشیان بدۆڕێنن و بەسەلامەتی قوتار نەبن !
٤ـ ئەگەر خۆڕازاندنەوەکە بەچەند هۆو وەسیلەیەکی ناشەرعی ئەنجام بدرێ ، وەک خۆکوتان و ددان تەنک و باریک کردن و

پرچ و زوڵف لەخۆنان و مووی دەم و چاو هەڵقەندن و .. هتد![1]

---

(۱) ڕوونکردنەوەیەکی پێویست لەبارەی خۆجوان کردنەوە :

بەپێویستی دەزانم هەروا بەکورتی ئەم چەند خاڵە لەوبارەوە بخەمەڕوو :

۱- لەسەر هەرکام لە پیاو و ئافرەت حەرامە کە خۆیان بەیەکتر بچوێنن ، چ لەبەرگ و پۆشاکدا ، وە چ لەهەر لایەنێکی دیکەدا کە تایبەتە بەیەکێکیانەوە ، پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام لەوبارەوە فەرموویەتی :( لعن الله المتشبهين من الرجال بالنساء ، والمتشبهات من النساء بالرجال ) رواه البخاري . واتە :
خوا لەعنەتی لەو پیاوانە کردوە کە خۆیان وەک ئافرەتان لێ دەکەن ، وە لەو ئافرەتانەش کە خۆیان وەک پیاوان لێ دەکەن .

---

کەواتە :
مەرجی یەکەمی خۆڕازاندنەوەو خۆجوان کردنی ئافرەت و پیاو ئەوەیە کە بەشێوەیەک نەبێ پێچەوانەی سروشتی خۆیان بێت .

۲- ئافرەت هەتا بۆی بکرێ واچاکە خۆی بۆ مێردەکەی جوان بکات ، چونکە خێزانی ( أبو إسحاق ) کە ئافرەتێکی گەنج بوو و حەزی بەجوانی دەکرد چوو بۆلای ( عائشة ) خوا لێی ڕازی بێ و لێی پرسی کە ئایا ئافرەت بۆی هەیە مووی نێوچاوانی بۆ مێردەکەی بکات ؟! ئەویش فەرمووی :( أميطي عنك الأذى ما استطعت) واتە : ئەوەندی لەتوانات دایە ئەو شتانە لەخۆت دا لابەرە کە مایەی ئازارو ناشیرین کردنن . *

دیارە لەبارەی موو هەڵقەندنیشەوە زانایان رایان جوێ جوێ یە ، زۆر لە ( حنبلي ) یەکان بەدروستی دەزانن بەمەرجێک بەئاگاداری و ڕەزامەندی مێرد بێت ، بەڵام ( نَوَوي ) پێی وایە کە تەنیا هەڵقەندنی ئەو مووانە بۆ ئافرەت دروستە کە لەچەناگەی و لەو شوێنانە دێن کە تایبەتن بەپیاوانەوە . **

---

* بروانە ( فتح الباري علي صحيح البخاري ) إبن حجر العسقلاني ج۱۰ ص ۳۱۰ ، وە (الحلال والحرام ..) ص ٥٦٣ أحمد محمد عساف .

** بروانە سەرچاوەی پێشوو ، وە ( الحلال والحرام في الأسلام ) د . يوسف القرضاوي ...

..........................................................

٣- بەڵام زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە هەرکام لە :

برۆ باریک کردن ( نَمْص ) و پرچ لەخۆنان ( وَصْل ) و ددان تەنک کردن ( وَشر ) و ددان لێک وەدوورخستن ( فَلْج ) و خۆکوتان ( وَشم ) ، حەرام و قەدەغەکراون و لەعنەت لە خاوەنەکانیان کراوەو لەو کەسەش کە ئەو جۆرە شتانە لەغەیری خۆی دەکات.*



* بڕوانە ( فتح الباري ... ) ج ١٠ ص ٣٠٥ - ٣١٢ .

تێبینی :

جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە ئێستا هەندێک گەنج و لاوی بەناو ( پیاو ) پەیدابوون کە لەخۆڕازاندنەوەو خۆتاس و لووس کردن دا لاسای ئافرەتان دەکەنەوەو ، هەتا ئی وایان هەیە هێندە سەرپێرێژناوەو تەبیعەت کچۆڵانەیە هەموو هەوڵی ئەوەیە کە وەک کچان بچێ !!

دیارە ئەو جۆرە لات و پووتانەش ڕەفتارەکەیان سەربارى ئەوەی کە هەمان حوکمی پێشووی هەیە لە ( لغو ) بوون و ( حەرام ) بوون دا ، ئابڕووی پیاوانیشیان بردووە ،

هەی خوا تۆویان ببڕێ !

جا خوێنەری بەڕێز !
ئەو شتانەی لەو ( ١٢ ) خاڵانەدا خرانەڕوو ژمارەیەک بوون لەو ( لغو ) ە سەرەکیو زەقانەی کە ئۆممەتی ئیسلامی بەتێکڕایی و گەلەکەمان بەتایبەتی گیرۆدەیان بووەو، لەسۆنگەی ئەمەوە خەڵکێکی زۆر دووچاری تەمەن بەزایەچوون و کات لەقیس چوونێکی بەبەلاش بووە ، ئەگەر لێشیان بپرسی داخوا بڕواتان بەڕۆژی دوایی و سزاو پاداشتی خوا هەیە یان نا ، ئەوە لێت تووڕە دەبن و هەر وەدارێشت هەڵدەگێڕن و دەڵێن : چۆن پرسیاری وامان لێ دەکەی ؟!
بەڵام گومانی تێدا نیە کە کەسێک بەڕاستی بڕوای بەوە هەبێت کە ڕۆژێک دێ زیندوو دەکرێتەوەو دەچێتە بەر دادگای خواو لە وردو درشتی ژیانی و هەموو دەقیقەو ساتەکانی تەمەنی و ، هەر قسەیەکی کردوویەتیو ، هەر سیلە چاوێکیو، هەر هەنگاوێکی و ، هەر قمە خواردنەوەیەکیو ، هەر پاروە خواردنێکی و ، هەر درەمێکی و .. هەر .. هەر .. هتد ، لێی دەپرسرێتەوە ، ئەگەر هێندەی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێ ( وإن كان مثقال حبةٍ من خردل أتينا بها .. ) (١) ، ئەوە بێگومان ژیانی بەو شتە پووچانەوە بەفیڕۆ نادات و هەوڵ دەدات هیچ تاوێکی تەمەنی لە قسەیەکی خێرو کردەوەیەکی پەسند خاڵی نەبێ و ، هەموو دەمێ ئەگەر سەرگەرمی کارو کاسبیەکی حەڵاڵ و پێویست بێ دەنا یان دوو ڕکات نوێژ دەکات ، یان بیر لە تاوانەکانی دەکاتەوەو سەرکۆنەی نەفسی خۆی دەکات ، یان لەخوا دەپاڕێتەوە ، یان نەزانێک فێر

---

(١) الأنبياء/٤٧

دەکات ، یان قورئان دەخوێنێ ، یان زیکرێک دەکات ، یان موتالآی کتێبێکی بەسوود دەکات ، یان سەرنجی یەکێک لە دروستکراوانی خوا دەدات و پەندێک وەردەگرێ ، یان سەردانی خزم و دۆست و برادەرو دراوسێ یەکی دەکات و ، یان فەرمانی دایک و بابی جێبەجی دەکات ، یان دڵی ماڵ و خێزانەکەی خۆش دەکات و ، پەروەردەیان دەکات و ، قسەیەکی خێریان بۆدەکات ، یان سەر لە نەخۆشێک دەدات ، یان یارمەتی لێقەوماوێک دەدات ، یان یەخەو بەرۆکی کافرو زۆرداران دەگرێ و لە وڵاتیان دەردەکات ، یان ئازارێک لەسەر رێ ی مسوڵمانان لادەبات .. یان .. هتد .

دیارە بابایەکیش بەرنامەیەکی هێندە فراوانی هەبێ کە ئەو هەموو ئەرکانەی پێ بسپێرێ ، کەچی ئەو ، ئەو هەموو ئەرکە پیرۆزانە پشتگوێ بخات و ، تەمەنی خۆی بەو شتە پڕوپووچ و بەدانەوە بەرێ بکات ، دیارە ئەوە زۆر بەدبەخت و چارەڕەش و سەربەهەش و بێ بەشەو ، یان ترووسکەی بڕوای بەڕۆژی دوایی هەر لەدڵ دا نیە ، یان ئەگەر هەشە یەکجار کەمەو دڵی وەک پەلاسی ڕەشە .

خوێنەری بەڕێز !

باbەتی ڕۆژی دوایی باbەتێکی چڕوپڕەو ئەگەر بمانەوێ لەهەموو لایەنەکانی بکۆڵینەوە حەوجێ چەند باسێکی خەست و خۆڵ دەبین ، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئامانجی ئێمە لە نووسینی هەموو ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیەدا بەس ڕوونکردنەوەو تیشک هاویشتنە سەر کاکڵ و مەبەستی ئەو وشەو زاراوە بنەڕەتییانەیە کە دەوری بەردی بناغەو کۆڵەکەو پایە دەبینن لە بەرنامەی خوادا ، بۆیە بەس بەخستنەڕووی هێڵە سەرەکییەکانی ئەم جۆرە باسانە واز دێنین ، بەڵام مەسەلە ـ یەکی گرنگ ماوە بەپێویستی دەزانم لەم پاشکۆیەدا بیتوێژینەوەو تا ڕاددەی بۆلوان پەردەی لەسەر لابەرین :

ئەو مەسەلەیەش بریتییە لە سەلماندنی هاتنی ڕۆژی دوایی :

هەڵبەتە بەڵگەش بۆ سەلماندنی هاتنی ڕۆژی دوایی زۆرو زەوەندەن ، بەڵام ئێمە بە هێنانەوەی پێنج بەڵگان وازی لێ دێنین :

١ـ هاتنی ڕۆژی دوایی گفت و بەڵێنی خوایە :

خوای میهرەبان فەرموویەتی :( وأقسموا بالله جَهْدَ أيمانهم لايبعث الله مَنْ يموت بلى وعداً عليه حقا ولكن أكثر الناس لايعلمون ) النحل / ٣٨ . واتە :

وە سوێندێکی پتەویان بەخوا خوارد کە خودا ئەوانەی دەمرن زیندوویان ناکاتەوە ، با ، بەڵێنی داوەو ڕاستە ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن .

بەڵێ مادام خوا گفت و بەڵێنی داوە کە ڕۆژی دوایی دێ و مردووان زیندوو دەکرێنەوە ، حەتمەن دەبێ ئەو گفت و بەڵێنە

راست بێ ، چونکە ئەگەر وانەبێ ، ئەوە پەنا بەخوا هەم بەڵێن شکاندن و هەم درۆ ، کە دوو سیفەتی خراپ و دزێون لەخوادا دێنەدی ، بێگومان خوای بەرزو مەزنیش خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو لەهەموو سیفەتێکی نزم و دزێو بەری یە .

دیسان خودای پەسند ئاکار چەندان جار لە قورئانی بەڕێزدا ئامۆژگاری کردووین کە لە درۆکردن و بەڵێن و پەیمان شکاندن دووربین ، وەک دەفەرموێ :( وأُوفوا بالعهد إنَّ العهد كان مسئولاً ) الأسراء / ٣٤ . واتە : وە بەڵێنتان بەرنەسەرێ ، بەڵێن پرسینەوەی لەسەرە .

٢ـ خوا هیچ شتێکی لەبەر ئاسێ نابێ :

خوای دەسەڵات دار فەرمویەتی :( إنما أمره إذا أراد شيئًا أنْ يقول له كُنْ فيكون ) النحل / ٤٠ . واتە : بێگومان فەرمانی وی کە شتێکی ویست بەس ئەوەیە کە پێی بڵێ ببە یەکسەر دەبێ .

وەک لەخاڵی یەکەمدا باسمان کرد زیندووکرانەوەی مرۆڤان و هاتنی ڕۆژی دوایی شتێکە خوای بەرزو مەزن گفت و بەڵێنی لەسەر داوەو ، خوداش مەحاڵە گفت و بەڵێنی نەباتە سەر ، بەڵام یەکێک بۆی هەیە بپرسێ ، باشە ئەوە سەلماندمان کە خودا گفتی داوەو گفتیشی دەباتە سەر ، بەڵام کێ دەڵێ خوا تواناى بەجێ هێنانی هەموو گفت و بەڵێنێکی هەیە ؟!

جا لەوەڵام دا دەڵێین :

أ- خودا زانیاری تەواوی بەهەموو شتێک هەیەو دیارە زانیویەتی کە دەتوانێ ڕۆژی دوایی بێنێتەدی ، بۆیە گفتی لەسەر داوەو ئەگەر زانیبای پێی ناکرێ گفتی لەسەر نەدەدا .

ب- بوونەوەرو ئینسان دروستکراوی خودان و ، وەک چۆن لە سەرەتاوە توانای بەسەر دروستکردنیان دا شکاوە ، دواجاریش دوای تێکچوون و مردنیان توانای بەسەر چاککردنەوەو ژیاندنەوەیان دا دەشکێ .

کەسێکیش گومانی وابێ خوای بێ وێنە ناتوانێ مرۆڤ پاش مردنی زیندوو بکاتەوەو ، بوونەوەر دوای تێکچوونی چاک بکاتەوە ، گومانێکی یەکجار بەدو ناماقووڵی بەخوای بەدیهێنەر بردوە کە تەنانەت لە بابایەکی گۆزەکەریش ناوەشێتەوە چ جای خوای پەروەردگار !

چونکە ئێمە دەبینین گۆزەکەر ئەگەر بێت و گۆزەکەی لێ بشکێ لەئاقار دروستکردنەوەی دا دەستەوستان نابێ و ، دەتوانێ لەتکە سواڵەکانی بهاڕێت و بیانکاتەوە بە قوڕو گۆزەیەکی چاکتریش لەی پێشوویان لێ دروست بکاتەوە ؟!

خوای زاناش لەوبارەوە فەرموویەتی : ( أَوَلَمْ يَرَ الانسان إنا خلقناه مِنْ نطفة فاذا هو خصيم مبين . وضرب لنا مثلا ونسي خلقه . قال مَن يحيِ العظام وهي رميم ، قل يحيها الذي أنشأها أُول مرة وهو بكل خلق عليم ) يس / ٧٧ - ٧٩ .

واتە : ئایا مرۆڤ- لێرەدا مەبەست مرۆڤی بێ بڕوایە- نازانێ کە ئێمە لە تۆوێک دروستمان کردوە ، کەچی ئێستا بۆتە دمبەدمەکەرێکی ئاشکرا ؟ وە وێنەیەکی بۆ ئێمە هێنایەوەو ، دروست بوونی خۆی لەبیرچۆوە ، گوتی : کێ ئێسکان دەژیەنێتەوە لەحاڵێک دا کە ڕزیون ؟ بڵێ ئەو کەسەی یەکەم جار هێنایەتەدی زیندووی دەکاتەوەو ، بە هەموو دروستکردنێکیش زانایە .

٣- تینوو‌بوونی مرۆڤ بۆ دادگه‌ری ی ، به‌ڵگه‌ی بوونیه‌تی :

خوای زاناو توانا مرۆڤی وا هه‌ڵخستوه که تینوو و عه‌ودالّی ئه‌و شتانه بێ که حه‌وجێیانه‌و ، حه‌تمه‌ن هه‌ر شتێکیش مرۆڤ پێویستی پێی هه‌بێ و سروشتی بۆی گرگرتنوو و تینوو بێ ده‌بێ هه‌بێ ، چونکه خوا فێڵ له سروشتی ئینسان ناکات ، وای لێ بکات تینووی شتێکی نه‌بوو بێ ، بۆ وێنه مرۆڤ تینوو ده‌بێ و جه‌سته‌ی داخوازی ئاوی لێ ده‌کات ، خوداش ئاوی له‌دنیای واقیع‌دا خوڵقاندوه ، بۆ وه‌ڵامدانه‌وه‌ی ئه‌و داخوازی یه سروشتی یه‌ی مرۆڤ .

که‌واته : تینوو‌بوونی ئینسان به‌ڵگه‌ی هه‌بوونی ئاوه ، با ئه‌و ئاوه له‌هه‌موو کات و جێ یه‌کیش‌دا وه‌به‌رچاو نه‌یه‌ت .

ده‌جا هه‌روه‌ک چۆن جه‌سته‌ی مرۆڤ تینوو و عه‌ودالّی ئاوه ، به‌هه‌مان شێوه‌ش ویژدان و سروشتیشی تینوو و گرگرتووی چه‌سپاندنی دادگه‌ری یه‌و ، هه‌موو ئینسانێکی سروشت ساغ هه‌تا ده‌مرێ هه‌ر به‌هیوای ڕۆژێکه که ته‌رازووی دادگه‌ری تێدا داده‌نرێ و ملی سته‌مکاران باده‌درێ و مافی مافخوراوان ده‌ستێنرێ و ، پاک و پیس‌لێک هه‌ڵداوێردرێن و به‌ره‌و جێگاو ڕێگای پڕیه‌پێستیان به‌ڕێ ده‌کرێن .

جا بێگومان ئه‌و دادگه‌ری یه‌ی که ویژدان و سروشتی هه‌موو مرۆڤێک داخوازی ده‌کات له‌م ژیانه دنیایی یه‌دا نابینرێ ، که‌واته حه‌تمه‌ن ده‌بێ ڕۆژێک هه‌بێ که ئه‌و داخوازی یه سروشتی یه‌ی مرۆڤی تێدا جێ به‌جێ بکرێ و ، ئه‌و تینووایه‌تی‌یه‌ی بشکێنرێ ، ئه‌و ڕۆژه‌ش ڕۆژی دوایی یه .

٤- ژیانی دنیا بێ دوا ڕۆژ ڕۆمانێکی بێ ئاکام و چیرۆکێکی بێ تامە :

بێگومان لەژیانی دنیادا سەدان و هەزاران دیمەن و بەسەرهاتی وا دێنەبەرچاو کە وەک ڕۆمانێکی بێ ئەنجام و چیرۆکێکی بێ تامن ، بۆ وێنە ( کێ ) مان لەژیانی دا چەندان کەسی چاکەکارو خێرخوای نەدیوە کە هەموو ژیانی تەرخان کردوە بۆ چاکەکاری و خزمەتی خەڵک و وەک مۆمێک خۆی تواندۆتەوە لەپێناوی بەهرەمەندکردنی خەڵکیدا ، بەڵام لەباتی پاداشت دانەوەو ئافەرین بۆکردن هەردەم ئامانج و نیشانەی تیرو توانجی ملهوڕو دڕندەخوان بووەو ماڵ ئاواییشی لەژیان کردوە بێ ئەوەی هیچ کەس پێی بڵێ چاکت کرد ؟!

دیسان ( کێ ) مان چەندان کەسی بەدکارو ئەڕخوازی نەدیوە کە شەوو ڕۆژی لێک گرێ داون بۆ خراپەکاری و ئازاردانی خەڵکیو وەک کەری دێزە خۆی لە دەیان ئاخسان هەڵداشتوە تاکو هەرنەبێ دڵی خەڵکی ئازار بدات ؟!

وە دەیان کەسیش هەبوون کە لەسەر ئەو تاوانبارییو بەدکاری یەی چەپڵەیان بۆلێداوەو بارەکەڵلایان بۆ کێشاوەو دەستیان بۆ لەملێ داوەو ، بەو شێوەیە ژیانی بەڕێ کردوە بێ ئەوەی لەگوڵێ کاڵتری پێ گوترابێو مافی هیچ ستەم دیدەیەکی لێ ئەستێنرابێ و ، دواییش بەمردنی خۆی مردوەو وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچووە ؟!

دەباشە ئایا ژیانی هەرکام لەو چاکەکارو بەدکارانە ڕۆمانێکی بێ تام و چیرۆکێکی بێ ئەنجام نیە ؟! دەی چۆن

خوای کاربەجێ و لێزان ڕۆمانی بێ ئاکام و چیرۆکی بێ تامی لێ دەپشکوێتەوە ، واتە چۆن شتێک لەخودا دەپشکوێتەوە کە مرۆڤی گچکەو نابووت پێی ڕازی نیەو بەهەڵەی دەزانێ ؟!

کەواتە حەتمەن دەبێ ڕۆژێک هەبێ تەرازووی دادگەری خودای تێدا دابنرێ و چاکان و خراپان بەپاداشت و سزای خۆیان بگەن و ویژدانی مرۆڤایەتیش ئاسوودە بێ و دڵی دابمرکێ و ، ڕۆمانە بێ ئاکامەکانیش چاکترین ئاکامیان پەیدا بێ و ، چیرۆکە بێ تامەکانیش خۆشترین تامیان تێدا بێ ، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی سزاو پاداشت ( یوم الدین ) ە .

٥- لەدوا ڕۆژدا ئەبێ چەسپاندنی دادگەری ی مەحاڵە :

خوای دادگەر فەرموویەتی : ( ونضع الموازين القسط ليوم القيامة فلاتظلم نفس شيئا وإن كان مثقال حبة مِنْ خردل أتينا بها وكفى بِنَا حاسبين ) الأنبياء / ٤٧ . واتە : وە تەرازووە دادگەرەکان لەڕۆژی دوایی دا دێنین ، جا هیچ کەسێک تۆزێک ستەمی لێ ناکرێ ، وە - هەر کردارێک - ئەگەر سەنگی دەنکە خەرتەلەیەکیشی هەبێ دەیهێنینەگۆڕێ ، وە ئێمە بەسین بۆ ژماردن و پاراستن - ی کردەوان - .

بەڵێ لەڕاستی دا دادگەری ی تەواو کە لەسزادانی تاوانباران و چاکەدانەوەی چاکەکاران دا خۆی دەنوێنێ لە دادگای خوای پەروەردگاردا نەبێ نایەتەدی .

با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست وێنەیەک بێنینەوە :

گریمان لەسەر زەوی توانرا دادگایەک پێک بێ کە ئامانجی هەرە بەرزی لەسەرکردنەوەی چەوساوەو بەشخوراوان و

جەزرەبەدانی طاغووت و ستەمکارانە ، جا ئێستا با هەندێک لەو ستەمکارو طاغووتانەی دەستیان بەخوێنی خەڵکی چەوساوە سووربووە بیان هێنینە ئەو دادگایەو بزانین چ حوکمێکیان بەبالا دەبڕێ کە پڕبەپێستیان بێ ، بۆ وێنە : فیرعەونی میسرو حەججاجی کوڕی یوسف و جەنگیزخانی مەغۆلی و هیتلەری ئەڵمانی و ستالینی ڕووسیا و کەمال ئەتاتورکی تورک و جەمال عەبدولناصری عارەب و سەددامی تکریتی و موحەممەد ڕەزا شای ئێران ، دیارە هەرکام لەم ستەمکارە نەگریسانە بوونە هۆی کوشتنی سەدان کەسی بێ تاوان و جەرگ سووتانی سەدان دایک و باب و بێوەژن بوونی سەدان ئافرەت و هەتیو بوونی هەزاران منداڵ !!

بێگومان توندترین حوکم کە دادگای گۆڕین بەبالای ئەو طاغووتانەی ببڕێ ئەوەیە کە حوکمی لەسێدارەدانیان دەربکات ، بەڵام ئایا بەکوشتنی نەفسێک دەگونجێ تۆڵەی سەدان و هەزاران نەفس لە کوژراو و جەرگ سووتاو و بێوەژن ماو و هەتیو کەوتوو بکرێتەوە ؟!!!

بێگومان نەخێر ، بەڵام دەزانی دادگای دواڕۆژی خودا چ جۆرە سزایەکی پڕبەپێست بۆو جۆرە کەسانە دادەنێ ؟!

یەکێ ملیۆنەها ساڵیان بەبالا دەبڕێ ! واتە بارتەقای تەمەنی ئەو کەسانەی جوانەمەرگیان کردوون و بەژمارەی هەناسەی ساردی ئەو مندالانەی هەتیویان کردوون و هێندەی ئەو ئێش و ژانەی بەجەرگ و هەناوی ئافرەتانی بێوەژن ماوو دایک و بابانی جەرگ سووتاویان گەیاندوە ، سزایان دەدات !

کەواتە :

بەڵێ هاتنی ڕۆژی دوایی گفت و بەڵێنی خوای لەسەرەو ،

خوداش هیچ شتێکی بێ زەحمەت نیەو ، مرۆڤیش تینووی دادگەری یەو ، ژیانی دنیاش بێ دوا ڕۆژ وەک ڕۆمانێکی بێ ئەنجام و چیرۆکێکی بێ تام وایەو ، لەدوا ڕۆژیش دا نەبێ دادگەری ی تەواو نایەتەدی ، کەواتە حەتمەن دەبێ ڕۆژی دوایی هەبێ ، بۆئەوەی دادگەری ی بچەسپێ و ، ژیانی دنیا مانای هەبێ و ، مرۆڤ تینووایەتی بشکێ و گفت و بەڵێنی خوداش ڕاست دەربچێ .

وآخر دعوانا أنِ الحمد لله رب العالمين .

# دواقسەم

خوێنەری بەڕێز !

دەمەوێ دواقسەی خۆمت لەکۆتایی ئەم ئاڵقەی سێ یەمەدا ، بۆ لەم خاڵانەدا کورت بکەمەوە :

یەکەم : لەو ڕێبوار ( مسافر ) ە نەفام ترو کورت بین تر نیە کە بەبێ توێشوو ( زاد ) وەڕێ دەکەوێ ، ئەگەر سەفەرێکی چەند سەعاتیش بێت ، چونکە وەک گوتراوە :

( نان ڕەفیقە ) ! هەربۆیەش خوای میهرەبان و زانا پێمان دەفەرموێ :( .. وتزودوا .. ) واتە : وە توێشوو هەڵگرن - بۆ سەفەری قیامەت و بەرەوخوا چوونتان - بەڵام چ توێشوویەک کەڵکی ئەو سەفەرە دەگرێ ؟! ( فأن خَيْرَ الزاد التقوى .. )[1] البقرة / ۱۹۷ . بێگومان چاکترین توێشوو تەقوایە .

کەواتە :

با وریا بین و چاک خۆمان سازو تەیار بکەین بۆ سەفەری دوورو درێژو ترسناک و چارەنووس سازی دواڕۆژمان !

دووەم : ئەو کەسەی کە بەبیانووی خۆئامادەکردن بۆ سەفەری قیامەتێ ژیانی دنیای وەلادەنێ و بە کەمبایەخ تەماشای دەکات ، نەک هەر دژی ئایین جووڵاوەتەوە ، بەڵکو ئەو توێشوو پەیداکردن ( تزود ) ەش - کە دنیای بۆ وەلاناوە -

---

(۱) مەسەلەی پارێزکاری ( تقوى ) لە کتێبی ( ڕێگای صالح بوون و بەرەوخوا چوون ) دا تا ڕاددەیەک توێژراوەتەوە ، بڕوانە : قۆناغی چوارەم : پارێزکاری و وردبوونەوە .

بۆتە خەیاڵێکی پووچ ! چونکە پەیداکردنی توێشووی سەفەری قیامەت بە وازلەدنیاهێنان پێک نایەت ، دەنا ئەگەر وابا خوای کاربەجێ هەر لەسەرەتاوە دنیای دروست نەدەکردو یەکسەر دەیبردینە قۆناغی قیامەتەوە !!

بەڵێ بۆ توێشوو پەیداکردن و خۆسازکردن بۆ سەفەری بەرەوخوا چوونمان نەک هەر پەکمان لەسەر وەلانان و بەکەم سەیرکردنی ژیانی دنیا نەکەوتوە ، بەڵکو بەبێ قۆڵ لێ هەڵکردن و گرنگی پێدانی ژیانی دنیا ، ئەو توێشوو پەیدا کردن و خۆسازکردنە هەر پێک نایەت ، چونکە ( تقوى ) و ( العمل الصالح ) بریتین لە جموجۆڵ و ڕەفتارەکانی ئینسان بەگوێرەی بەرنامەی خوا بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندی ی خوا لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیان دا .

بەڵێ : پارێزکاری ی و کردەوەی چاک بەرهەمی پابەند بوونی ئینسانن بە یاسا و دەستوورەکانی ئایین و بەرنامەی خواوە ، دیارە یاساو دەستوورەکانی بەرنامەی خواش هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرنەوە ، فیکری ، سیاسی ، مەعنەوی ، کۆمەڵایەتی ، ئەخلاقی ...

کەواتە : ئینسان تەنیا کاتێک دڵنیا و مسۆگەر دەبێ کە توێشووی سەفەری قیامەتی پێیە کە تەقوا و کردەوەی چاکی وەدەست هێنابن ، وە بەس کاتێک وەک پێویست مەعنا و چەمکی واقیعیی و ڕاستەقینەی پارێزکاری ی و کرداری چاک لەخۆیدا دێنێتەدی ، کە بەهەموو لایەنەکانی ئیسلامەوە پابەند بێت و هەموو یاسایەکانی بەڕێوەبەرێ ، دیارە بەس کاتێکیش ئەو کارەی بۆ مەیسەر دەبێت کە لە هەموو بوارەکانی ژیانی دا سەرگەرمی چالاکی و جموجۆڵ بێت ، خوای زاناش لەوبارەوە

- لەسەر زمانی خەڵکی مسوڵمان کە بە قارۆونیان گوتوە - فەرموویەتی : ( وابتغ فیما آتاك الله الدار الآخرة ولاتنسَ نصیبك مِنَ الدنیا .. ) القصص / ٧٧ . واتە :

وە بەهۆی ئەوەوە کە خوا پێی داوی مەنزڵگای دوارۆژ داوا بکە ، بەڵام بەشی خۆشت لەدنیا لەبیر مەکە !

سێیەم : کەواتە با ئاگاداربین و بەردەوام لەخــــوا بپارێینەوە کە لە مەسەلەی ( دنیاو دوارۆژ ) و هـــەر مەسەلەیەکی دیکەش دا بەرەو ڕاستەڕێ ( صراط المستقیم ) ڕێڕوونیمان بکاتو ، نە هێندە بەزیانی دنیاوە ماندوو(١) بین و تێیدا نقووم بین کە لێمان ببێتە بتو سەنـــەم و پەرچ و لەمپەری سەر ڕێ ی بەرەوخوا چوون ، وە نە واشـــی پشت گوێ بخەین و بەکەمی سەیر بکەین کە نەتوانین خـــوای تێدا لەخۆمان ڕازی بکەین و توێشووی سەفەری قیامەتـــی تێدا وەچەنگ بخەین !



﴿رَبَّنا آتِنا مِنْ لَدُنكَ رَحمَةً وَهَيِّئْ لَنا مِنْ أمرِنا رَشَداً﴾ .

---

(١) مەبەست لە ماندووبوون و نقووم بوون لێرەدا ، لەبواری ماددی و ڕابواردن دایە ، دەنا ماندووبوون بەزیانـــی دنیاوەو تێیدا نقووم بوونی لەو ڕووەوە کە کێڵگەی تێـــدا چاندنی تۆوی پارێزکاری ی و کردەوەی چاکە،بەرزتریـــن خەسڵەتە .

# کاکڵی باسەکان

| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |
| ٤٠ | ئەنجام و بەرهەمی بڕوابەدوا ڕۆژ بوون |
| ٤٠ | یەکەم : خۆسازکردن بۆبەر دادگای خودا |
| ٤٤ | دووەم : جڵەوتوندکردنی ئەسپی نەفس |
| ٤٦ | سێیەم : دنیا بەکەمگرتن ( الزهد ) |
| ٤٩ | چوارەم : گرنگی دان بەژیانی دنیا |
| ٥٢ | پێنجەم : خۆپاراستن لە ئازاردانی خەڵکی |
| ٥٥ | شەشەم : جەرگداری و فیداکاری |
| ٥٧ | حەوتەم : کات بەفیڕۆنەدانی بەبەلاش |
| ٥٩ | ( لغو ) ە زەق و سەرەکی یەکان |
| ٨١ | پاشکۆ |
| ٨٢ | چەند بەڵگەیەک لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی |
| ٩٠ | دواقسەم |
| ٩٣ | کاکڵی باسەکان |



لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دا

چاپخانەی شەهیدان

# ئه‌م زنجیره‌یه

به‌مه‌به‌ستی ئه‌وه نووسراوه كه ببێته مه‌شخه‌ڵێك بۆ تێگه‌یاندن و پێگه‌یاندن و فێركردن و په‌روه‌رده‌كردنی كۆمه‌ڵه مسوڵمانێكی پێشه‌نگی هه‌ڵبژارده ، كه بتوانن به‌رنامه‌ی خواو ڕێ و شوێنی پێغه‌مبه‌ری پێشه‌وا صلی الله علیه وآله وسلم ببووژێننه‌وه ، وه گه‌لی ماڵ وێران و بێ شوانیان له‌ژێر نیری سته‌م و چه‌وساندنه‌وه و له‌گێژاوی بێ قه‌واره‌یی قوتار بكه‌ن و ، له‌بن سێبه‌ری ئیسلام دا بیحه‌سێننه‌وه ، به‌مه‌ش گه‌وره‌ترین ئامانجی ژیانی دنیا وه‌ده‌ست بێنن كه بریتییه له ڕه‌زامه‌ندی خوا جل جلاله .



له بڵاوكراوه‌كانی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامی له كوردستانی عێراق دا

چاپخانه‌ی شه‌هیدان